ئۆریانا ڤالاچی

# پەیامێک بۆ ئەو کۆرپەیەی کە هەر لەدایک نەبوو

ڕۆمان

له فارسییه‌وه: شاهۆ حه‌سه‌نپوور



# پەیامێک بۆ ئەو کۆرپەیەی کە هەر لە دایک نەبوو

نووسینی ئۆریانا ڤالآچی

وەرگێرانی: شاهۆ حەسەنپوور

بابەت رۆمان

سەرپەرەشتیاری گشتی: ئازاد بەرزەنجی

دەرهێنانی هونەری: شیروان تۆفیق

مۆنتاژ: سەیران عەبدولرحمان

دیزاینی بەرگ: قادر میرخان

لە بڵاوکراوەی چاپ و پەخشی سەردەم ٢٠٠٣

ئەمشەو هەستم کرد کە هەی. وەك دڵۆپێك لـە ژیـان کـە لـە نەبوونـەوە سەرچاوەی گرتبـێ. بـە چاوانی کـراوەوە، لـە تاریکاییەکی ئەنگوستە چاودا ڕاکشابووم کە لە ناکاو لە دڵی تاریکی دا تروسکاییەك لـە زانـین و دڵنیـا بـوون درەوشـایەوە: بەڵێ، تۆ لەوێ بووی؛ تۆ هەبووی. دەتگوت نەشتەرێك بەر دڵم کەوتبوو. کاتێ دوبـارە گـوێم بـۆ دەنگـی نارێـك و شـێواوی دڵی گرتەوە، هەستم کرد هەتا ملان کەوتوومەتە نێو چاڵێکی ترسـناکی پـڕ لـە تـرس و دڵـە خورپـە. لـە گـەڵت دەدوێـم، بەلأم ترسێکی بەژان سەرتا پێـی لەشـی داگرتـووم. ئێستا لـە چـوار دیـواری ئـەم ترسـەدا دیـل بـووم و بـوونم ون کـردوە. هەوڵ بدە تێ بگەی: من لە کەس ناترسم. کارم بە کەس نیـە. لـە خـوداش ناترسـم. بـڕوام بـەم جـۆرە قسانەش نیـە. لـە ئازاریش ناترسم. ترسی من لـە تۆیـە، لـە تـۆ کـە چـارەنووس، بـوونی لـە نەبوونـەوە ڕفانـدو بـە دیـواری هـەناوی منیـەوە نووساند. ئەگەر چی هەردەم چاو لە ڕێت بووم و، دەمزانی ڕۆژێ هەر دێـی بـەلأم قـەت ئامـادەی پێشـوازی لـە تـۆ نـەبووم و، ئەم پرسیارە ترسـناکە ڕایچەلەکاندووم: نـەکا حـەز بـە لـە دایـك بـوون نەکـەی؟ نـەکا ڕۆژێـك بـە سـەرم دا بقیـژێنی و بڵێی: " کێ بە تۆی وتبوو منت ببێ؟ بۆ منت بوو؟ بۆ؟ " بچکۆلە گیان، ژیان واتە ماندوو بـوون! ژیـان واتـە ئـەو شـەڕەی هەموو ڕۆژێ دوبارە دەبێتەوە و دەگەڵ ساتە خۆشەکانی دا، کـە هەڵوێسـتەیەك نـەبێ چـی تـر نـین، دەبـێ نرخێکـی گـەلێ گرانی بۆ بدەی. ئێستا چۆن بزانم تووڕ هەڵدانت کارێکی ڕاسـتە یـا چـەوت؟ بـە چـی بـزانم ناتـەوێ بگەڕێیتـەوە بـۆ بـێ دەنگی. ئاخر ئەتۆ ناتوانی دەگەڵم بدوێی. دڵۆپی ژیانت تـەنیا گـرێ کوێرەیەکە و هیچـی تـر. گـرێ کوێرەیـەك کـە پێـك هـاتووە لـە چـەند خانـەی دروسـتکەر. لەوانەیـە ئەمـە ژیـان نـەبێ و تـەنیا هـەلی ژیـان بـێ. سـەرەڕای ئەمانـەش ئامـادەم هەرچی کە هەمە بیدەم لە پێنـاوی ئـەوەدا تـەنیا بـە جووڵانێـك یارمـەتیم بـدەی. دایکـم دەڵـێ هێمایـەکی وای لـە لایـەن منەوە پێ گەیشتووە و ئەمە هۆی لە دایك بوونم بووە.

بزانە، دایکـم منـی نەدەویسـت. مـن بـە هـۆی هەڵەیـەك و کەمتەرخـەمی کەسـێکی تـرەوەو لـە دایـك بـووم، دایکـم بـۆ ئەوەی لە دایك نەبم هەموو شەوێ دەرمانی لە پـەرداخێك ئـاو دەکـرد و بـە گریـان و دڵێکـی گیراوەوە دەیخـواردەوە. ئـەم کارەی هەموو شەوێ دوبارە دەکردەوە، هەتاوەکو شەوێکی هەستی کرد من لە زگی دا پێچ دەخۆم؛ لاقـم لـە زگـی دەدەم و، بەم جۆرە تێم گەیاند نامەوێ تورم بدا. ئەویش پەرداخە دەرمانەکەی کە بۆ دەمی بردبـوو ڕۆ کـردە سـەر عـەرز. چـەند مانگ دواتر من سەرکەوتوانە لە نێو تیشکی هەتاودا تلم دەخوارد، سەرەڕای ئەمەش نازانم ئەم کارەی دایکم ڕاسـت بـووە یان چەوت. کاتێ لە شادی دام و دڵم خۆشـە پـێم وایـە کـارێکی ڕاسـت بـووە کـاتێکیش دەردو بـەش مەینـەتیم هـەن پـێم وایە کارێکی چەوت بووە. سەرەڕای ئەوانەش کاتێ بـە دەم دەردو ئـازارەوە تلاومـەوە و، ژیـانم نـاخۆش بـووە، قـەت ئـەمم بە بیر دا نەهاتووە بڵێم بریا لە دایك نەدەبووم. نەبوون لە هەموو شتێك خراپترە. دوبارەی دەکەمەوە لـە ئـازار ناترسـم. ئازار دەگەڵ ئێمە لە دایك دەبێ. دەگەڵ ئێمە گەورە دەبێ، دەبێتە هاوڕێ و هاودەممان و، وا دەزانین بۆتـە پارچـەیەك لـە ئێمـە وەك ئەنـدامانی لـەشمان. ئـازار دەبـێ دەگـەڵمان بـێ. بچـکۆلە، ڕاسـتیەکەت دەوێ مـن ترسـم لـە مـەرگ نیـە؛ کـاتێ کەسێك دەمرێ واتە پێشتر لە دایك بووە. کەسێکی وا پێدەچێ لـە نەبوونـەوە هـاتووە. مـن لـە نـەبوون دەترسـم؛ لـەوەش دەترسم بڵێم قەت نەبووم. زۆرتر ژنان ئەم پرسیارە لە خۆیان دەکەن، بۆ منـداڵمان ببـێ؟ بـۆ ئـەوەی برسـیەتی بکێشـێ؟ بۆ ئەوەی لە سەرمان هەڵ لەرزێ؟ بۆ ئەوەی لە بـەر سـووکایەتی پـێ کـردن و خیانـەت ئـازار بکێشـێ؟ یـان بـۆ ئـەوەی لـە شەڕا یان بە نەخۆشی بمرێ؟ ئەم جۆرە مرۆڤانە هیوادار نین بەوەی منداڵەکەیان تێـر بـێ یـان شـوێنێکی گـەرمی هـەبێ. هیوایەکیان نیە کە منداڵیان وەفادرا بێ. ڕێزی لێ بگیرێ و تەمەنی ئەوەندە درێژ بێ بتوانێ ئەوەی نەخۆشـی و شـەڕە لـە سەر ئەم عەردە پاکی بکاتەوە و رایماڵێ. لەوانەیە ناحەقیان نەبێ، لەوانەیە واش نـەبێ. بـەلأم داخـوا، هـیچ بـوون باشـترە لە ئازار کێشان؟ من تەنانەت ئەو کاتانەی لە بـەر شـکان و کـوێرەوەری و بـێ هیـوایی فرمێسـك هەڵدەوەرێنم. دەگەمـەوە

ئەو ئاكامەی كە ئازارو بەش مەینەتی باشترە لە " هیچ نەبوون " و ئەگەر ئەم بۆچوونە لە مەڕ ژیان یان نەهێنی لە دایك بوون و نەبوون جێبەجێ بكەین بە دڵنیاییەوە دەڵێم لە دایك بوون باشترە لە قەت لە دایك نەبوون. باشە ، گەیشتن بەم ئاكامە سەبارەت بە تۆش ڕاستە ؟ گەیشتن بەم ئاكامە بەم مانایە نیە لە بەر خۆم تۆ دێنمە سەر ئەم دنیایە؟ بۆم گرنگ نیە لە بەر من چاوان بە دنیا هەڵێنیٚ یان نا، بە تایبەتی كاتی پێداویستییەكم بە تۆ نیە.

★★★ ★★★ ★★

لاقم لێ نادەی و ولاٚمم نادەیتەوە. چۆن دەتەوێ ئەم كارە بكەی؟ ماوەیەكی كورت نابێ هەی؛ ئەگەر ڕەزامەندی دكتۆرم گەرەك بێ گاڵتەم پێ دەكا. بەلاٚم من لە بری تۆ بڕیارم داوە: تۆ دەبێ لە دایك ببی. ئەم بڕیارەم پاش بینینی وێنەكەت دا. دیارە وێنەكە بڕێك لە تەمەنی تۆ گەورەتر بوو. وێنەی كۆرپەلەیەك بوو سێ حەوتووانە دەگەڵ گەلێ وێنەی تر و ڕێپۆرتاژێك كە لە ڕۆژنامەدا چاپ كرابوون. كاتێ سەیرم دەكرد ئەم ترسەی وا كوت و پڕ تووشی بوو بووم نەما. وەك گوڵێكی سەر سووری هێنەر بووی – وەك قەلاٚیەكی چكۆڵەو ڕووناك كە لە نێو قەلاٚیەكی گەورەتر دا دروست كرابێ – لە سەر قەدی گوڵەكە شتێكی وەك سەر كە لەولا و ئەو لای دو شتی زیادی پێوەیە كە پاشان دەبن بە مێشك دیارە. هێندێك لە خوارتر قوولاٚییەك كە پاشان دەبێ بە دەمت وەك لە وێنەكەدا دەردەكەوێ لە تەمەنی سێ حەوتوویی جوان لێك جیا ناكرێتەوە دیارە. سەرەڕای ئەوانەش نیشانەی بوونی چاوەكانت، شتێكی وەك بڕبڕەی پشت، دەمارەكان، زگ و سپڵ و ڕیخۆڵە تێتدا دەردەكەون و چرۆ دەكەن. دڵت تەواوەو گەورەشە – لە چاو لەشت – نۆ كەرەت گەورەتر لە دڵی من. وەك ترومپا كار دەكا و لە ڕۆژی هەژدەهەمەوە لێدانی ئاساییە: چۆن دەتوانم فرێت بدەم؟ بە من چی تۆ بە هۆی هەڵە یان ڕووداوێك دروست بووی؟ ئایا ئەم دنیایەی كە ئێمە تێیدا دەژین بە هۆی ڕووداو یان هەڵەیەكەوە دروست نەبووە؟ هێندێك پێیان وایە لە سەرەتادا هیچ شتێك نەبووە جیا لە ئارامیەكی ڕەها و بێ دەنگیەكی گەورەو بێ جوڵە. پاشان پرشكێك پەڕی و جولاٚنێكی توونــد، ئەوەی نەبوو پێك هات. پاش ئەم جولاٚنە جولاٚنی تریش پێكهاتن كە هیچ كامیان چاوەڕوان كراو نەبوون. كەسیش ئاگاداری ئاكامەكانی دواییان نەبوو. لەم كردە چالاكیەدا لەوانیە بە هەڵە یان هەڵكەوت خانەیەك دەركەوت كە پاشان بوو بە دەیان هەزار خانەی تر هەتا كار گەیشتە ئەو جێگەیەی دار و ماسی و ئینسانەكان لە دایك بوون. پێت وایە پاش ئەم ڕووداوانە كێ لە هەڵبژاردنا ئازادو سەربەست بووە؟ كەس لە خانەكانی پرسی ئەم ڕەوتەیان پێ خۆشە یان نا؟ یان كەس نیگەرانی سەرما، برسیەتیی و چارە ڕەشی بوو؟ من بیردۆزێكی وا ڕەد دەكەمەوە. ئەوە وتمان كەسێكی واش هەبوو – بۆ وێنە خودایەك كە لە بان زەمان و شوێن بێ و، بتوانرێ بە سەرچاوەی هەموو شتێك دابنــدرێ – من لەمە دڕدۆنگم چاك و خراپی بۆ گرنگ بووبێ. هەموو شتێك بۆیە ڕوویدا كە دەبوو ڕووبدا و ڕووشی دا. بۆ تۆش هەروا دەبێ. لێپرسراوەتی ئەم هەڵبژاردنە خۆم وە ئەستۆی دەگرم.

بچكۆلە گیان: ئەم هەڵبژاردنەم لە خۆ بە زل زانینەوە نیەو : لە دایك بوونت سەیران نیە. تاقەتی ئەوەم نیە بە زگی هەڵمساوەوە بە شەقامەكاندا بگەڕێم. هێزو توانای ئەوە لە خۆمدا شك نابەم شیرت بدەمێ، بت شۆم و، فێری قسە كردنت بكەم. من ژنێكم كارو بەرپرسایەتیم هەیە و هەزار ئۆگریم لە دڵ دان: پێم وتی پێویستیم بە تۆ نیە. بەلاٚم تۆ دەگەڵ من دەبی. بۆم گرنگ نیە حەز بكەی یان نەكەی. من هەمان بێ عەداڵەتی كە سەبارەت بە خۆم، دایك و باوكم، داپیرەو باپیرەو دایك و باوكی ئەوانیش ڕەوا بینراوە بە تۆش ڕەوا دەبینم. لەوانەیە لە گیانلەبەرێك كە ناوی مرۆڤی لێنرا پرسیاریان كردبا: دەتەوێ لە دایك بی یان نا؟ لە بەر ترس و دڵە خورپە خۆی با دەداو بە لێبڕاوییەوە ولاٚمی نای دەدایەوە. بەلاٚم كەس لە ڕای وی نەپرسی، ئەویش بە ناچاری لە دایك بوو و ژیا. پاشان ئەویش گیانلەبەرێكی تری كە پرسی پێ نەكردبوو هێنایە سەر ئەم دنیایەو، بۆ خۆی ماڵ ئاوایی لە دنیا كرد. ئەمەی دوایش ئەم كارەی دوپاتە كردەوەو ئەو ڕەوتە هەزاران هەزار ساڵ درێژەی كێشا. لەوانەیە ئەگەر ئەم جەبرە نەبایە هەنووكە ئێمەش

نەدەبووین. دلێرو خۆراگر بە بچکۆلە. وەرە سەر ئەم دنیایە وا بیر دەکەیتـەوە تـۆوی گیایـەك کـە عـەردی دەدڕێ و ئـارام ئارام چەکەرە دەکا، دلێـر نیـە؟ هـەر ئەوەنـدە بەسـە بایـەك هـەلْ بکا و بـوونی ئـەم گیایـە بکا بـە " هـیچ " یـان قاچـی فەرخـە مشـکێك برِێـك توونـد لـە سـەر سـەری دابنـدرێ هـەتا دوبـارە بچـێتەوە نێـو خـاك. کەچـی هـەروا خـۆڕاگرە و،چەکەرەدەکاو گەورە دەبێ و تـۆوی تـر بـلاّو دەکاتـەوە و دارسـتانێك بەرهـەم دێنـێ. ئەگـەر ڕۆژێکـی بـە سـەرم دا هـاوار بکەی و بلێی: " بۆچی منت بوو؟ " لە ولاّمت دا دەلێم: " منیش هەمان شت دەکەمەوە کە دارەکـان هـەزاران هـەزار سـالْ لەمەو بەر کردیان و دەیکەنەوە و منیش پێم وایە کـارێکی باشـم کـردوە ". گـرنگ لێـرەدا ئەوەیـە مـرۆڤ دار نیـە. ئـازارو کوێرەوەرییەکانی مرۆڤ لە گەلْ ئازارەکانی دار بەراورد ناکرێن. پێویست ناکا هـیچ کـام لـە ئێمـە دارسـتان بەرهـەم بێنـێ. هەموو دەنکە تۆوێك گیای لێ شین نابێ و زۆربەی تۆوەکان لە بری ئەوەی ئاوس بن، ون دەبن. بـا لـە سـەر بـڕوای خۆمـان بین. دیارە پێچەوانەی باسەکەش هەر ڕاستە. بچکۆلە، هزری ئێمـە پـڕە لـە دژ. لەوانەیـە تـۆ شـتێك پەسـند بکـەی و هـەر زوو پێچەوانەکەی ببینی و بزانی پێچـەوانەی بیردۆزەکـە وەك بیردۆزەکـە هـەر کامـەیان ڕاسـتی دەیانگرێتـەوە. مـەنتیقی من لەوانەیـە سـبەی بـە ئامـاژەی پەنجەیـەك سـەرو بـن بـێ. کەواتـە هەنووکـە هەسـت دەکـەم دوو دلْـم و کەوتوومـە نێـو گێژاوەوە. پێدەچێ هۆیەکەی ئەوە بێ جیا لە تۆ دەگەلْ کەسی تـر دەردی دلْ ناکـەم. مـن ژنـێکم ژیـانی تـەنیایی پەسـند کردوە. باوکت دەگەلْ من ناژی. لەم بارەوە نارِەحەت نیم – تەنانەت ئەو کاتەی نیگام لەو دەرگایە ڕادەمێنـێ کـە ئـەو بـە هـەنگاوە قایمـەکانی پێـی دا تێپـەڕی و، چـووە دەر؛ منـیش بـەرگریم لێ نـەکرد بـۆ ئـەوەی بمێنینـەوە. چـونکە ئێمـە قسەیەکمان بۆ وتن نەبوو.

*** *** ***

لە بەر تۆ سەردانی دوکتورم کرد، بەو مەبەستەی لەمەڕ چۆنیەتی ئاگاداری لێکردنـت ڕێنـوێنی پێویستی لێوەرگرم. دوکتور سەری لەقاندو وتی دەبێ سەبر بکەم. ئەو دەیگوت دلْنیا نیە زگم هەیـە یـان نـا. پاشـان پێـی وتم دوو حـەوتی تـر بگەرِێمەوە لای بۆ ئەوەی بزانێ تۆ بەرهەمی خەیالْی منـی یـان نـا . دەگەرِێمـەوە لای . بـۆ ئـەوەی پێـی بسـەلمێنم هـەموو زانیـاری و زانسـتەکەی لـە بەرامبـەر هەسـتی شەشـەمم و نەسـتم دا فلسـێکی نـاهێنێ. چۆن پیاوێك دەتـوانێ لـە هەسـتی ژنێکی زگ پڕ بگاو دەرکی بکا؟

خۆ پیاوان زگیان پڕ نابێ. لە ڕاستیش دا بە ڕای تۆ زگ پڕنەبوونی پیاوان بە نـەقس و کـەمی دادەنێـی یـان ئیمتیـاز؟ هەتا دوێنێ پێم وابـوو زگ پـڕ نـەبوونی پیـاوان لایـەنی باشـی و لـە سـەر بوونیانـە بـەلاّم ئێسـتا پـێم وایـە ئەمـە لایـەنی کەمی و نەقسە. گەلْی جێگەی خۆ ڕانان و شـانازییە ئینسـان بتـوانێ گیانلەبـەرێك لـە زگـی خـۆی دا هـەلْبگرێ و لـە بـری کەسـێك خـۆی بـە دوو کـەس بزانـێ. هێنـدێك سـات پێـت وایـە دنیـات فـەتح کـردوە و هـیچ هێزێـك نـاتوانێ – نـە ئـەو ئازارانەی دەبێ تەحەممولیان بکەی، نە ئەو کارەی لەوانەیە بە جێی بێلْی و، نـە ئـەو ئازادییـەی کـە بـێ شـك لـە دەسـتی دەدەی – ئەو هێورییەی وەدەستت هێناوە بی شێوێنێ. ئـەتۆ کچـی یـان کـوڕ؟ پـێم خۆشـە کـچ بـی. پـێم خۆشـە ڕۆژێکـی ئەوەی من هەستی پێ دەکەم تۆش هەستی پێ بکـەی. دایکـم دەلْـێ: " ئەگـەر کچـت بـبێ بەدبەختیـەکی گەورەیـە. " مـن قەت ئەم قسەیە پەسند ناکەم. کاتێ دلْی تەنگ دەبێ دەلْێ: " ئـاخ ! بریـا پیـاو بـام! " دەزانم کـە دنیـای ئێمـە بـە دەسـت پیاوان و، بۆ خۆیان دروست کراوە. زولْم و ستەم لە دەرونیاندا ڕەگێکی قوولْ و کـۆنی هەیـە. ئـەو چیرۆکانـەی پیـاوان بـۆ پاساوی ژیان بۆ خۆیان هۆنەریان بـوون، ئـەوان دەلْێن یەکـەمین گیانلەبـەری ئینسـانی ژن نیـە، بـەلْکو پیاوێکـە بـە نـاوی "ئادەم "، " حەوا " ش پاش ئەو هاتووە بۆ ئەوەی " ئادەم " لـە تـەنیای دا نەمێنێتـەوە و، تووشـی ئـازارو ڕەنـج کێشـانی بکا. لە وێنەی سەر دەرگاو دیواری کلیساکان خودا پیرە پیاوێکی ڕیش چـەرمگە نـە پیریـژنێکی قـژ چـەرمگ. پالْەوانـەکان

هەموویان پیاون لە پرۆمتە ★[1] وە کە دەستی بە ئاگر ڕاگەیشت هەتا ئیکار ★★[2] کە دەیویست بفڕێ. حەزرەتی مەسیح یش کە کوڕی باوك و روح القدسە[3] ئەو ژنەی کە ئەوی بووبوو لە مریشکێکی کڕ یان دایکی شیری زیاتر هیچی تر نەبوو . سەرەڕای ئەمانە ژن، ناسك و جوانە. سەربردەیەکە کە دلێریەکی بێ کۆتایی گەرەکە، شەڕێکە کۆتایی نیە. ئەگەر کچ بی پێویستە زۆر شتان فێر بی. یەکەم دەبێ شەڕێکی قورس بکەی بۆ ئەوەی بیسەلمێنی و بلێی ئەگەر خودایەك هەبێ دەتوانێ ژنێکی قژ سپی بێ یان کەنیشکێکی جوان و دلڕفێن. هەروەها دەبێ شەڕێکی گەورەی دیکەش بکەی هەتا بتوانی بلێی ئەو ڕۆژی " حەوا " سێوی قەدەغە کراوی لێکردەوە "تاوان " لە دایك نەبوو، بەڵکوگەورەییەکی بەشکۆ لە دایك بو کە بە " نافرمانی " ناودێر کرا. لە کۆتایی دا دەبێ ئەوەندەی تریش شەڕ بکەی بۆ ئەوەی بیسەلمێنی کە لە نێو ئەندامی خڕو نەرمت دا " شتێك بە ناوی " " عەقڵ " هەیە کە دەبێ گوێ بۆ بانگی حەقی بگیرێ. دایکایەتی، پیشە نیە. ئەرکیش نیە. تەنیا مافێکە لە هەزاران مافی تر. ئەوەندە ئەمە دوویات و سەد پات دەکەیتەوە و هاوار دەکەی گەروت دەگیرێ و ماندوو دەبی و نائومێدانە تێك دەشکێی. بەڵام نابێ دڵ سارد ببیەوە خۆڕاگری و بەربەرەکانی گەلێ جوانترە لە سەرکەوتن. هەوڵدان بۆ گەیشتن بە مەقسەد بەچێژترە لە گەیشتنە مەقسەد: ئەگەر هاتی سەرکەوی یان گەیشتییە مەقسەد ئەو کاتە هەست بە بۆشاییەکی گەورە دەکەی و ، بۆ ئەوەی ئەم بۆشاییە پڕ بکەیتەوە دەبێ دووبارە ڕێگە بگریتەوە بەرو ئامانجی نوێ بخولقێنی. بەڵێ حەز دەکەم کچ بی. هیوام وایە قسەکانی دایکم دوبارە نەکەیەوە، هەر وەك منیش دوبارەم نەکردنەوە.

★★★ ★★★ ★★★

ئەگەر کوڕیش بووی مـن هەر رازیم، بگرە زیاتر لە کچ بوونت. بەم جۆرە لە زۆر سووکایەتی پێ کردن و ژێر دەستەیی قووتار دەبی. بۆ وێنە ئەگەر کوڕ بی کەس لە تاریکی شەودا ناتوانێ دەست درێژیت بکاتە سەر. ئەگەر کوڕ بی پێویست ناکا روخسارت جوان بێ بۆ ئەوەی لە یەکەمین نیگادا جێگەی پەسند بی. کاتێ دەگەڵ خۆشەویستەکەت دەخەوی ناچار نی قەزاوەتی رقاوی تەحەمول بکەی، کەس بە تۆ نایژێ " تاوان " ئەو ڕۆژە لە دایك بوو کە " حەوا " سێوی قەدەغەکراوی لێکردەوە. خەم و خەفەت کەمتر دەخۆی. بۆ ئەوەی بیسەلمێنی خودایەك ئەگەر هەبێ پێویستت بە شەڕ نیە بۆ ئەوەی بلێی پیرێژنێکی قژ سپی یان کیژۆڵەیەکی جوانکیلەیە. دەتوانی لە بەرامبەر هەر کەسێکی دا کە پێت خۆش بێ لاساری بکەی. دەتوانی خۆشەویستی بکەی بێ ئەوە تاکە شەوێك لەبەر ئێش و ژان لە خەو ڕاچڵەکێی و، وا بزانی کەوتوویە گێژاوەوە. دەتوانی بەرگری لە مافی خۆت بکەی بێ ئەوەی جوێنت پێ بدرێ. دیارە کوڕ بوونیش هەروا ئاسان نیە. گەلێ مافت هەن پێشێل دەکرێن و دەبێ ئەو کۆیلەییەی تەحەموول بکەی. پێت وا نەبێ ژیان بۆ پیاو زۆر ئاسانە. ئەگەر بەهێز بی بەرپرسایەتی قورس و زۆرە ملیت لێ قایم دەکەن. چونکە ڕیش و سمێڵت هەن ئەگەر بگری یان بەزەیی و خۆشەویستی لە دەورنتا هەبێ گاڵتەت پێ دەکەن. بێ ویستی خۆت فرمانت پێ دەدەن پیاو بکوژی یان بکوژرێی. پێت خۆش بێ یان نا وات لێدەکەن لە پێشیلکارییەکانی چاخی بەردین دا شەریکیان بی دەگەڵ ئەمانەش

---

[1] ★پرۆمتە : یان پرۆمتیئۆس لە ئوستورەکانی یونان دا , بە پێی گێرانەوەیەك ئینسانی لە گەڵ دروست کردو , سەرەڕای دژایەتی زئۆس , خودای خوداکان ئاگری لە ئاسمان دزی و هێنایە سەر عەرز و دای بە ئینسان . زئۆس وەك تەنبێ کردن ئەوی لە سەر تاشە بەردێك لە قەفقاز زنجیر کرد و لەوێ هەڵۆیەك ڕۆژانە جەرگی دەخوارد و شەوانەش جەرگی سەر لە نوێ دروست دەبۆوە . ئەم ئەشکەنجەیە ئەوەندە درێژەی کێشا هەتاکوو هیرکول رزگاری کرد . و . ف

[2] ★★ ئیکار : یان ئیکارۆس لە ئەفسانەکانی یوونان دا کوڕی دایدالوس بوو . کاتێ بەو باڵانەی کە باوکی دروستی کردبوون ڕایەدکرد زۆر نزیکی خۆر بووەوە ئەو پەڕانەی بۆ دروست کردنی باڵەکان بە کار هاتبوون سووتان و ئەویش لە ئاوی دەریا کەوت . و . ف

[3] روحی پیرۆز

دا، پێدەچێ پیاو بوون چیرۆکێك بێ شیاوی پێدا هەڵگووتن. ئەگەر کوڕ بووی حەز دەکەم ئەو پیاوە بی من لە خەونەکانم دا بە دوایا ویلم: دەگەڵ خەڵکی فەقیرو بێ دەسەلات لەسەرخۆ بە، لە گەڵ مل هوڕەکان توونـد. ئەوانەی خۆشیان دەوێی دەگەڵیان بە ڕووحم بە، دەگەڵ زاڵمان بێ رووحم. یەکەمین دوژمن ئەو کەسەیە دەڵێ مەسیح کوڕی باوك وروح القدسە. نەك کوڕی ئەو ژنەی هێنایە سەر ئەم دنیایە.

بچکۆلە، هەوڵ دەدەم تێت بگەیەنم پیاو بوون تەنیا هەر ئەوە نیە کلکێکی لە پێشەوە پێوە بێ. پیاو بوون واتە کەسێك بوون؛ بۆ منیش ئەمە گرنگە تۆ کەسێك بی. مرۆڤ بوون وشەیەکی جوانە سنورێك بۆ پیاو بوون و ژن بوون دیاری ناکا. جیاوازییەك لە نێوان ئەوەی کە ئەم کلکەی هەیە یان نیەتی دانانێ. دڵ و مێشك هیچ کامیان نە نێرن نە مێ. هەڵس و کەوتیش نێرو مێی نیە. ئەگەر دڵ و مێشکت هەبێ قەت بە سەرت دا ناسەپێنن چونکە ژنی یان پیاو دەبێ ئاوا بیر بکەیتەوەو، وا هەڵسوکەوت بکەی. تەنیا دوو شتم لێت گەرەکە. یەکەم ئەوە کە ئەوپەڕی کەڵکی خۆت لە نەهێنی و موعجیزەی لە دایك بوون وەربگرە و، قەت بۆ ڕەزاڵەت و پەستی مل نەدەی. پەستی حەیوانێکی خوێن خۆرە هەردەم لە بۆسەدایە و، هەموو ڕۆژێ چنگەکانی بە بیانووی بەرژەوەندی و لە سەرخۆ بوون و، جاری واشە عەقڵی و پێگەیشتویی بە جەستەی گشت ئینسانەکاندا دەباتە خوارێ و بە دەگمەن هەن توانای خۆڕاگریان هەبێ. ئینسانەکان کاتێ دەکەونە مەترسیەوە ڕوو دەکەنە نزمی و پەستی کاتێ مەترسیان لە سەر نابێ دەبنەوە ئینسان. قەت نابێ لە بەرامبەر مەترسی دا خۆت ون بکەی. بگرە ئەگەر ترس هەڕەشەی نەمانیشت لێ بکا. لە دایك بوون ترس دێنێ: ترس پەشیمانی.

لەوانەیە وتنی ئەم قسانە بە تۆ زوو بێ. لەوانەیە باشتر بێ ئێستا باسی غەم و ناحەزیەکانت بۆ نەکەم و تەنیا باسی لایەنی جوانی و ڕازاوەیی و پاکیەکانت بۆ بکەم. بەلام نامەوێ فریوت بدەم و بلێم ژیان وەك فەرشێکی ئاوریشمی نەرمە دەتوانی بە پێی پەتی بەسەریدا بڕۆی و، نەڵێم ژیان ڕێگەیەکی بڵێند و نەویی و بەردەلانە. ئەو بەردانەی تێیان هەڵدەنگوی و دەت خەن و بریندارو خوێناویت دەکەن. ئەو بەردانە تەنیا دەتوانی بە چەکمەی ئاسن بە سەریان دا بڕۆی. دیارە ئەوەندە هەر بەس نیە ئەوە لاقیشت داپۆشین. کەسێك پەیدا دەبێ بەردێکت لە سەری ڕاکێشێ. دەرسی ئەمڕۆ تەواو بوو کچەکەم ، کوڕەکەم  وانەکەت فێر بووی ؟ ئەگەر خەڵك گوێ بیستی ئەم قسانە بێ خودا دەزانێ چیمان پێ دەڵێن. تۆ بڵێی خەڵك بە شێتی یان بێ ڕەحمی تاوانبارم نەکەن.  تازەترین وێنەم سەیر کردی. لە پێنج حەوتەیی دا درێژیەکەت سانتی مەترێکیش نابێ. دیارە زوو دەگۆڕێی. ئێستا وەك گوڵێکی نارێك ناچی؛ وەك ماسییەکی چکۆلەی کە باڵە جوانەکانی تازە سەریان وەدەر ناوە. چوار باڵ کە دەبن بە دەست و قاچەکانت. چاوەکانت دوو خاڵی چکۆلەی ڕەشن لە نێو بازنەیەك دا دیاری کراون و چووکێکی چکۆلەی جوانیشت هەیە! لە ڕاپۆرتەکەدا نووسراوە کە تۆ لەم قۆناغەی ژیانتا دەگەڵ کۆرپەلەی هیچ شیردەرێکی تر جیاوازیت نیە. بۆ وێنە ئەگەر فەرخە پشیلە بایەی هەمان شێوەت دەبوو نە روخسارێکت دەبوو نە مێشك، بچکۆلە، دەگەڵ تۆ دەدوێم. بەلام ئەتۆ نازانی. ئەم تاریکیەی تۆی لە خۆی گرتوە تەنانەت هەست ناکەی کە هەی. دەتوانم فرێت بدەم تۆ قەت نازانی کە فڕێم داوی. قەت نازانی ئەگەر فڕێم دای کارێکی ناحەقم دەرحەق کردوویی یان بە پێچەوانەوە نیعمەتێکی گەورەم پێ بەخشیوی.

*** *** ***

دوێنێ تەندروستیم باش نەبوو. سەبارەت بەوەی دوێنێ پێم وتی فڕێت دەدەم و هەروەها تاوانبارم کردی بەوەی لێم تێ ناگەی بم بوورە. قسە بوو کردمن. لەمەڕ بڕیارەکەم هیچ ئالوگۆڕێك پێك نەهاتووە ئەگەرچی ئەم بڕیارەم دەبێتە هۆی سەر سووڕمانی خەڵکی. دوێ شەو دەگەڵ باوکت قسەم کرد. لە سەر تەلەفۆن هەواڵی بوونی تۆم پێ دا . ئەگەر ڕاستیەکەت دەوێ ئەم هەواڵەی پێ خۆش نەبوو. لە سەرەتادا کە پێم وت ماوەیەك بێدەنگ بووین. پاشان گوێم

له دەنگی بێ لایەنی بوو کە وتی: " چەندی پێویستە؟ " لە مەبەستەکەی نەگەیشتم و لە ولامیا وتم: " بە ڕای من نۆ مانگ، لەوانەشە هەشت مانگ بخایەنێ. " وتی: " من باسی خەرجیەکەی دەکەم. وتم: " خەرجی چی ؟ " وتی: " خەرجی ئەوەی لە کۆڵ خۆتی بکەیەوە. " بەڵێ ئەم وشانەی بەکار هێنا وەك ئەوەی تۆ جیاوازییەکت دەگەڵ زبڵ نەبێ. بەوپەڕی لەسەرخۆییەوە ولامم دایەوە کە هەڵت ناکەنم. لە مابەینی وتارێکی دوور و درێژدا کە ئامۆژگاری، ئەمر و داواکاری نێوەڕۆکی قسەکانی بوو ویستی تێم بگەیەنێ تووشی هەڵەیەکی گەورە دەبم. بە تایبەتی کە ئەو تەمای نیە دوبارە دەگەڵ من بژی. زوو زوو دەیوت: " بیر لە کارەکەت بکەوە، لەوبەرپرسایەتیانەی کە هەتن، لە پلەی کۆمەلایەتی و هەروەها سرت و خورتی خەلکیش. " لە ماوەی قسە کردنی دا من وەلامم نەدەدایەوە ئەویش بێ دەنگی منی بە نیشانەی ڕەزامەندی من لە قسەکانی دەزانی. لە کۆتایی دا وتی نیگەرانی خەرجیەکەی نەبم و وتی: " خەرجیەکەی پێکەوە بەش دەکەین. " ئەم قسەیە تێکی دام. ئەوەندەی نەما لە سەر تەلەفۆن دەنگم هەلێنم. تەلەفۆنەکەم داخست. بیرم لەوە کردەوە ماوەیەکی ئەم کابرایەم خۆش ویستوە.

خۆشم دەویست؟ ڕۆژێکی بە تێرو تەسەلی دەبێ سەبارەت بە خۆشەویستی بدوێین. ئەگەر ڕاستیت دەوێ هەتا ئیستاش نازانم مەبەست لە خۆشەویستی چیە. بە ڕای من خۆشەویستی فێلێکی گەورەیە لە بەر هێور کردن و خافلاندنی خەلك داهێنراوە. گوێت لە هەر کەس دەبێ باسی خۆشەویستی دەکا. قەشەکان، کارگێرانی سیاسی، ڕاگەیەنراوو پڕوپاگەندەکان. ئەدیبەکان، ئەوانەی بەڕاستی خەریکی خۆشەویستی و دلدارین. من لەم وشە روکەش و ڕوالەتیە کە لە گشت شوێنێك و بە گشت زمانەکان هەیە بێزارم. " ڕێگە ڕۆیشتنم خۆش دەوێ "،" خواردنەوەم خۆش دەوێ "، " جگەرە کێشانم خۆش دەوێ "، " ئازادی، هاورێکەم، منداڵەکەم خۆش دەوێن " ئەمانە چ واتایەك دەبەخشن. هەوڵ دەدەم هەتا بۆم دەکرێ ئەم وشەیە بەکار نەهێنم. قەت نالێم خۆشەویستی ئەو وشەییە دڵ و دەرونم ئالۆز و شێواو دەکا. لەڕاستی دا نازانم خۆشم دەوێی یان نا. من لە دەلاقەی خۆشەویستیەوە سەیری تۆ ناکەم بەلکو بە هەست و سۆزی ژیان دەڕوانمە تۆ. سەبارەت بە باوکیشت ئەوەندەی بیرم دێ و بیر دەکەمەوە پێم وایە قەت خۆشم نەویستوە. پەسندم کردوەو ویستوومە، بەلام خۆشم نەویستوە. هەروەها ئەوانەی پێش لەویش هەبوون لە ڕاستی دا شتێك نەبوون جیا لە تارماییەکی ئازاردەری هەوڵ و تەقەلایەك، کە هەردەم هەرەسیان هێناوە. ژیان دەگەڵ باوکت تەنیا سوودێکی هەبوو. ئەویش هیچ شتێك بە ڕادەی ئەو وزەو توانا نەهێنیەی دوو کەس بەرەو یەکتری دەکێشێ - بۆ وێنە ئۆگری ژنێك بۆ پیاوێك و بە پێچەوانەوە — هەرەشە لە سەربەستی مرۆڤ ناکا. وزەی هیچ کۆیلەیی و یەخسیریەك ناگاتە وزەی ئەم بە کێش کردنە بۆ ئەوەی بە لاوازی و بێ هیوایی بمێنێتەوە. ئای لەو ماڵ وێرانییەی کەسێك ژیانی خۆی دەکاتە دیاری بۆ ئەم وزەیە. بەم کارە تەنیا خۆمان لە بیر دەکەین و دلێری و سەربەستیمان لە دەست دەدەین. وەك ئەو سەگەی بێ هوودە پەلە قاژەیەتی هەتا بگاتە کەنارەکانی وشکایی. ئەو کەنارانەی بوونی دەرەکیان نیە. کەنارێك کە ناوی " خۆشەویستی " و " خۆشویسترانە ". ئەگەر بگەیتە ئەم کەنارە ئەم پرسیارە لە خۆت دەکەی، بۆچی خۆت خستە نێو ئەم ئاوەوە: چونکە لە خۆت رازی نی و بەو هیوایەی ئەوی لە خۆت دا نایبینی لە خەلکی ترا ببینی؟ یان لە ترسان و لە بەر تەنیایی و ماندوویەتی و بێ دەنگیەوە بووە ئەم ڕێگەیەت هەلبژاردووە. یان پێویستت بەوەیە کەسێك داگیر بکەی یان داگیر بکرێی؟ بە بڕوای هێندێکان ئەمانە مافی " خۆشەویستییە ". بەلام بە رای من خۆشەویستی زۆر لەو شتانە کەمترە بۆم باس کردی. خۆشەویستی جۆرە برسیتیەکە پاشان کە تێر دەخۆی خواردنەکە دەلێی لە سەر دلت کۆ بۆتەوە و هۆکەی خراپ هەرس کرانە. یان بلێین خۆشەویستی وەك هەستی ڕشانەوەیە. چۆنە وشەیەکی نەفرین لێکراو نەبێ ئەم مانایەم بۆ لێك بداتەوە. زۆرحەز دەکەم هەر چۆنێکی بێ لە ماناکەی بگەم. زۆر تامەزرۆ و تینووی زانینیم. جاری وایە پێم وایە خۆشەویستی ئەوەیە دایکم بۆی باس کردووم: ئەو هەستەی کاتێك

دایكێك منداڵەكە لە ئامێز دەگرێ. هەر نەبێ هەتا چكۆڵەی جنێوت نـاداتێ و ئازارت پێ ناگەیەنێ. ئەگەر لە تۆ كە وجوودی من دەدزیوخوێنم دەمژی ئەم پرسیارە بكەم كە سێ پیتی "ع"، " ش" و "ق " م بۆ لێك بدەیەوە دەڵێی چی؟

لە نێوان من و ئەویندااران دا تەنیا لێك چوونێك هەیە. ئەوان كاتێ سەیری وێنەی خۆشەویستەكەیان دەكەن هێور دەبنەوە، منیش هەروام. كاتێ وێنە نازدارەكانت بە دەستمەوەن تووشی دڵە خورپە دەبم. كاتێ ماندوو هیلاك دێمەوە ماڵێ بە دوای وێنەكانت لە لاپەری گۆڤارو ڕۆژنامەكاندا دەگەڕێم و ڕۆژ بە ڕۆژ تەمەنت حیساب دەكەم. ئەمڕۆكە تۆ شەش حەوتووی و زۆرتر كەوتوویتە بەر دڵان! بە سەری گەورەو تاسەوە ڕەنگی مرۆڤت بە خۆوە گرتووە. بڕبڕەی پشتت بە تەواوی دەركەوتووە. ئیتر دەستەكانت شتێكی زیادی و نادیار نین. وەك باڵی ماسیش نەماون بوونە بە دەست و پێ. دەست و پێت لێ، رووان. حەز دەكەم دەست و لاقەكانت و لەشت بلاوێنمەوە. ئەرێ ژیان لەم خوارە لە نێو منداڵدان دا چۆنە؟ لە وێنەكاندا دەردەكەوێ لە نێو منداڵدان دا موعەلەقی. وەك ئەو گوڵدانە شیشەیانەی گوڵێكی سوریان تێ دایە. دەگەڵ ئەو تۆوەی وەك پەتێكی درێژ كە سەرەكەی گۆپكەكەیەكی سپی ریشاڵی سپی و خاڵی شینی لە سەرە بە تەواوی جیا دەكرێتەوە. دەڵێن زەویش لە مەودایەكی چەند هەزار كیلۆمەتریەوە وێنەیەكی وای هەیە. بەڵێ بە ڕاستی پێدەچێ زەوی پەتێكی بێ كۆتایی، پەتێك بە درێژایی چیرۆكی ژیان بەرەو تۆ سەری دەرهێناوە. چۆن دڵیان دێ بڵێن دروست بوونی مرۆڤ تەنیا ڕوداێكە لە سروشت دا و، هیچی تر؟ دوكتور وتویەتی دوبارە بچمەوە لای و خۆی نیشان بدەمەوە. سبەی دەچمەوە لای جار جار ترس و نیگەرانی جارجاریش شەپۆلی شادی سەرتا پێی لەشم دا دەگرێ.

لە كاتێك دا دوكتور خەریكی هەڵگرتنی وەرەقەیەك بوو بە دەنگێك كە دەیویست دڵسۆزی و شادی پێوە دیار بێ وتی: " پیرۆزبایت پێ دەڵێم خانم." بێ ویست رستەكەم چاك كرد." كچم. " دەتگووت زللەیەكی تەڕم لە بنان گوێی دا. شادی و شەوقی لە روخساری دا پەڕی. بە بێ مەیلییەوە وتی " ها ! " پاشان قەڵەم جافی بە سەر وشەی خانم دا هێناو نووسی " كچ ". بەم جۆرە لە هۆدەیەكی سپی دا بە هۆی پیاوێكی بەرگ سپیەوە زانست بە ڕەسمی پێی ڕاگەیاندم كە تۆ هەیت.

لە سەرەتادا، كاتێ ناوەكەی چاك كردم سەرم سوورما. ئەمە پێش ئاگادار كردنەوەی نەزانراوەكانی داهاتوو بوو. زانست یش كاتێ فرمانی پێدام رووت ببمەوە وە لە سەر تەختەكە درێژ بم شێوەی وتنەكەی دڵسۆزی پێوە دیار نەبوو. زانینەكەی هەستی نەجوڵاندم. بۆ خۆم دەمزانی تۆ لە كوێی. دوكتور و دەستیارەكەی سەیری دەموچاویان نەدەكردم، پێ دەچوو زۆر ناشیرین بم. بەڵام بە پێچەوانەوە سەیری یەكتریان دەكرد. كاتێ لە سەر تەختەكە پاڵ كەوتم لاقەكانم نەخستە جێگەی خۆی دەستیارەكە لێم تورە بوو، بە تووڕەییەوە لاقی گرتم و وتی ئەمەیان لێرە دانێ و ئەویتریشیان لەوێ. هەستم كرد پارچە گۆشتێكی توندو سارد بووەوەم. پاش ماوەیەك ترسناكترین بەشی چیرۆكەكە دەستی پێكرد: دوكتور دەستەوانە لاستیكەكەی لە دەستی كرد و پەنجەی بە زۆری لە لەشم ڕۆ كرد. بە پەنجەی دەگەڕاو، پاڵی پێوە دەنا و دەگەڕا. ژا نێكی زۆری هەبوو پێم وابوو چونكە مارە نەكراوم دەیەوێ بتخنكێنێ. ئاخرەكەی پەنجەكەی دەرهێنایەوەو وتی: " زۆر باشی، هەموو شتێك ئاساییە. " هێندێك ڕێنوێنی نووسین و تووتیانە شی كردنەوە. زگ پڕی نەخۆشی نیە و، دۆخێكی بە تەواوی سروشتییە. پێی وتم هەر كارێكی پێشتر كردوومە، ئێستاش دەتوانم بیكەم. تەنیا نابی زۆر جگەرە بكێشم و لە ئاوی گەرم دا حەمام بكەم؛ هەروەها هەوڵی جینایەت كارانەش نەدەم بە نیگەرانیەوە پرسیم: " جینایەت كارانە؟ " وتی: " دیارە گشتمان دەزانین یاسا ڕێگە بەم ئیشە نادا ! " و بۆ ئەوەی لە هەڕەشە كردنەكەی دڵنیاتر بم حەبی لوئین تەنی بۆ نووسیم و داوای لێكردم هەر پانزدە ڕۆژ جارێك سەری بدەمەوەو پاشانیش

پارەی عیادەکە بخەمە سندووقەوە. لەم ماوەیەدا بزەیەکیشی نەهاتە سەر لێوان. دەستیارەکەش روویەکی خۆشی پێ نیشان نەدام. کاتێ دەرگاکەیان داخست زۆر بە ناحەزی سەریان دەلەقاند.

دەترسم ئەم هەڵسوکەوتانەت لا ئاسایی نەبێ و خوی پێوە نەگری. ئەم دنیایەی تۆ دەتەوێ بێیتە سەری. سەرەڕای هەموو ئەو قسانەی لە سەر گۆڕانی سەردەم دەکرێن ئەگەر ژنێك شووی نەکردبێ و منداڵی بکەوێتە سکەوە لە باشترین دۆخدا پێیدا هەڵدەڵێین. بە قارەمانی دادەنێن. قەت بە ژنێکی ئاسایی دانانێن. ئەو دەرمانفرۆشەی حەبەکانی لوئینتنی پێ دام دەیناسیم و دەیزانی مێردم نەکردوە. هەر کە نووسخەکەم پێدا چاوی پێ زەق بوون و بە سەر سووڕماوی سەیری کردم. پاشان چوومە لای بەرگ درووەکەم پاڵتۆیەك بۆ زستان بە دروون بدەم . بچکۆلە: ئەوەندەی بۆ وەرزی زستان نەماوە دەمەوێ پاڵتۆیەك بە دروون بدەم بۆ ئەوەی سەرمات نەبێ. بەرگ درووەکە دەمی پڕ لە دەرزی بوو و خەریکی ئەندازە گرتنم بوو. کاتێ پێم وت دەبێ پاڵتۆکەم فراوان بۆ بدروی چونکە زگم هەیە و هەتا زستان زگم گەورەتر دەبێ قولانجێك دەمی کردەوەو، سوور سوور هەڵگەڕا. ترسم ڕێنیشت نەکا دەرزیەکان قوت بدا. شوکر بۆ خوا دەرزیەکان نەچوونە گەرویەوە و ڕژانە سەر عەرزی. میترەکەشی لە دەست بەربۆوە. لەوەی کە تووشی شێواویم کرد پەشیمان بوومەوە. سەبارەت بە بەرێوەبەری ئەو ئیدارەی کە کاری لێدەکەم شتێکی وا روویدا. بمەوێ و نەمەوێ بەرێوەبەر کەسێکە کارەکەم لێ دەکرێ و بۆ بژیوی ژیانم پارەم پێ دەدا. ئینساف نیە ئەگەر پێی ڕانەگەیەنم کە لەمەو بە دوا ماوەیەك ناتوانم بچمە سەر کار. بۆ باس کردنی چوومە هۆدەی کارەکەی. ماوەیەك بە بێ دەنگی مایەوە. دوایی بە سەر خۆیدا زاڵ بوو بە پرتە پرت وتی ڕێز لە بریارەکەم دەگرێ و ، زۆری پێدا هەڵگووتم و لە لەخۆبردویم دوا. بەلام پاشان درێژەی دا وتی، ژیرانەتر وایە لە گشت شوێنێك ئەمە نەگێرمەوەو، وتی: " باس کردنی ئەمە لە لای ئێمە شتێکەو لە لای ئەوانەی تێناگەن شتێکی تر. دیارە هەتا ئەو جێگەیەی کە لەوانەیە ناچار بی بریارەکەت بگۆڕی ئەوە ئاوایە." لە سەر بابەتی گۆڕینی بڕواکەم زۆری جەخت کرد. ئەو وتی هەتا تۆ تەمەنت دەبێتە سێ مانگ ماوەم هەیە بیر بکەمەوە — کارێکی وا بکەم بیسەلمێنم ژیرو تێگەیشتووم؛ ئەم کارە گەلێ سەرنج ڕاکێشە، بۆچی لە بەر ئیحساسات وازی لێ بێنم؟ دەبوو جوان بیرم لێ بکردایەوە، ئەو مەبەستی چەند ساڵ یان چەند مانگ نەبوو: مەبەستی ئەوە بوو چارەنووسم دەگۆڕا. ئیدی ئیختیارم لە دەستی خۆمدا نابێ. لە بیرمان نەچێ شیرکەتەکەی ئەو منی بە ناوبانگ کردوەو حیسابی لە سەر کارەکەی من کردوە. ئەو بەرنامەی باش باشی بۆ من هەبوون. بەڕاستیش ئەگەر ویستبام گۆڕانێك لە بۆچوونم دا پێك بێنم، ناچار بووم لەو یارمەتی وەربگرم.

باوکت جارێکی تریش تەلەفۆنی کردەوە. دەنگی دەلەرزی. دەیویست بزانێ تاقی کردنەوەی دوکتور وەلامەکەی بە کام لادا بووە. وتم ئاکامەکەی موسبەتە. دوبارە پرسییەوە بە تەمام کارەکە جێبەجێ بکەم. بێ ئەوەی گوێی پێ بدەم تەلەفونەکەم داخست. نازانم بۆچی ئەگەر ژنێك شەرعەن زگی پڕ دەبێ ڕێزی لێ دەگرن، ڕێو ڕەسمی بۆ پێك دێنن و داوای لێدەکەن خۆی ماندوو نەکا و زۆر نەجووڵێ: زگ پڕ بوون گەلێ باشە، پیرۆزت بێ. ئا لێرە دانیشە. بحەسێرەوە. بەلام سەبارەت بە من هەموویان بێ دەنگ دەبن و بە ساردی هەڵسوکەوتم دەگەڵ دەکەن و تەنیا باسی لەبار بردن دەکەن. هەر کەسەیان سەربەخۆ پلان و بەرنامەیەکی هەیە بۆ ئەوەی لێکمان بکەن. جاری وایە زۆر نیگەران دەبم لە بەر خۆمەوە دەڵێم سەرکەوتن دەگەڵ کێ دەبێ: ئێمە یان ئەوان؟ لەوانەیە زەنگی ئەم تەلەفۆنەیە. تەلەفۆن ئەو تاڵیانەی کە بە لەبیرکراو دامنابوون تاڵتر کرد: ئەو نارەحەتیانەی پێم وابوو جێبەجێم کردبوون. ئەو نارەحەتیانەی لە خەونی خۆشەوە سەرچاوەیان دەگرت کەوایان تێگەیاندبووم خۆشەویستی شانۆیەکی ئاڵۆزە. برینەکان ساڕێژ دەبنەوە، جێگەیان نامێنێ، بەلام زەنگێکی تەلەفۆن بەسە گشت برینەکان سەرلەنوێ ببرژێنەوە وەك جێگەی شکاوی کۆن، کاتێ زەمان دەگۆڕێ.

*** *** ***

دنیای تۆ هەمان ئەو توورەکەیەیە نزیك، بە شەش حەوتووە تێدا کزت کردوە و لە نێو شلەیەکدای کە هەست بە بوونت دەکرێ. ئەم توورەکەیەیی کە پارێزگاریت لێ دەکا پێی دەڵێن توورەکەی کۆرپەلە کە شلەیەکی گیراوەی خوێی تێدایە کە ناهێڵێ هێزی کێش کردنی زەوی کارت تێ بکاو، دەبێتە هۆی بەرگری کردن لەوەی بە جوڵانی من بەر ئەولا ئەولا بکەوێ، هەروەها دەبێتە هۆی دابین کردنی خواردنت. هەتا ئەم چەند ڕۆژەی پێشوو تەنیا سەرچاوەی خواردنت بوو. بە هۆی پرۆسەیەکی زۆر ئاڵۆز و کەم زۆر نەزانراو بەشێك لەم شلەیە دەچووە نێو لەشت و کەڵکت لێ وەردەگرت. وە بەشێکیشت دەرداویشتەوە و سەر لە نوێ دروستت دەکردەوە. بەڵام ئێستا چوار ڕۆژە کە لە ڕێگە نێوکە پەتك خواردنت لە منەوە پێ دەگا. لەم چەند ڕۆژەدا زۆر شتت گەشەیان کردوە. هەر کاتێ بیری لێ دەکەوە : سەرنجم ڕادەکێشرێ و زۆرتر دەچیتە ناو دڵمەوە. ئاوەڵ منداڵ- تۆوەکەی وەك پێستێکی گەرم لەخۆوە پێچاوە و قایم بووە، ژمارەی خانەکانی خوێنت زۆر بوون هەمووی ئەم گەشانە بە خێراییەکی سەرسووڕهێنەر روویان داوە: تۆڕی ڕەگەکانت دەبیندرێن. ڕەگە خوێنبەرەکانت قایم بوون؛ وریدی پەتی نێوکت کە ئۆکسیژنی لەشی من و بڕی ئەو ماددە کیمیایانەی پێویستی پێیە دابین دەکا و توونـد و قایم بوون: سپڵت گەورە بووە و هەروەها دەسگای جنسیشت گەورە بووە. ئێستا دەزانی کوڕی یان کچ. بچکۆلە گیان ئەوەی لە هەموان زۆرتر سەرنجم ڕادەکێشێ دەستە چکۆلەکانتە کە جوان دەرکەوتوون. نینۆکەکانیشت دیارن. ئێستا دەم و لێوی چکۆڵەت هەن! زمانیشت خەریکە گەشە بکا. قوڵایی جێگەی بیست ددانەکانیشت. سەرەڕای ئەوە ئەوەندە چکۆلە و سووکی – نزیکی سێ گرم – چاویشت هەن! ناتوانم بڕوا بکەم هەموو ئەم شتانە لە ماوەی چەند حەوتوودا روویانداوە. پێم وایە ئەمە لە ڕاستیەوە دوورە. سەرەڕای ئەمانە دەست پێکی دنیا واتە ئەو کاتەی خانەو پاشان گشت ئەو شتانەی لە دایك دەبن و هەناسە دەکێشن و، دەمرن بۆ ئەوەی دوبارە لە دایك ببنەوە دەبێ هەر ئاواهی بوو بێ: جولانێك، ئاوسانێك و، زۆر بوون و بلاّو بوونەوەی ژیان، بێ برانەوە و بەو پەڕی خێراییی و ئاڵۆزیەوە، بێ برانەوە بەوپەڕی نەزم و پێگەیشتوویییەوە. چەندە پێچ دەخۆی بچکۆلە! کێ دەڵێ لە لانکی ئاوەکانی دەوروبەرت دا خەوتووی؟ ئەتۆ قەت خەوت لێ ناکەوێ قەت ئارام نابیتەوە. کێ دەڵێ ئەتۆ لە ئارامیدا بە سەر دەبەی؟ کێ وتویەتی ئارام دەبی تەنیا زرینگانەوەیەکی ڕێك لە دەنگە سەبرەکان دەگاتە پەردەی گوێت؟ دڵنیام جم و جۆڵێکی بەردەوام فشاری وەك ترومپا کە سەرو خوار دەکا، توونـد توونـد هەناسەکێشان، هانکە هانك ، تەقینەوەی یەك بە دوای یەکی دەنگە توونـدەکان لە تۆدا هەیە. کێ وتویەتی ئەتۆ ماددەیەکی بێ گیانی کە دەکرێ بە کەچکێك دەرت بێنن؟ پێم دەڵێن ئەگەر دەتەوێ لە دەستی ڕزگارت بێ ئێستە کاتیەتی. واتە دەبوو سەبر بکەم هەتا دەبی بە مرۆڤێك چاوو پەنجەو دەمی هەبێ بۆ ئەوەی بت کوژم. پێشتر ئەتۆ زۆر لەوە چکۆلەتر بووی بدۆزرێیتەوە و هەڵکەندرێی. ئەوان شێتن.

*** *** ***

هاورێکەم پێی وایە من شێتم. ئەو مێردی کردوە و، لە ماوەی سێ ساڵ دا چوار کەڕەت منداڵی هەڵکەندوە. ئەو دوو منداڵی هەن و، ئەگەر ئەمەی دوایی لە دایك با، بۆی بەخێو نەدەکرا. داهاتی مێردەکەی ئەوەندە نیە. بۆ خۆشی کارێکی هەیە زۆری حەز لێیە و ناتوانێ وازی لێ بێنێ. خەسووی بە منداڵەکانی ڕادەگا چونکە ئەو بێچارەیە ناتوانێ بە باخچەیەکی ساوا[4] یان منداڵ ڕابگا ! بە قسەی ئەو بۆت بلوێ لە دنیای شاعیران دا بژی گەلێ خۆشە بەڵام ڕاستی شتێکی ترە. تەنانەت مریشکەکانیش بە ڕادەی ئەو هێلکانەی دەیکەن جووجکە هەڵ ناهێنن! ئەگەر هەر هێلکەیەك ببا بە جووجکە دنیا دەبووە مریشك خانە. تۆ دەزانی زۆربەی مریشەکان هیلکەکانی خۆیان دەشکێنن و دەیانخۆنەوە؟ دەزانی

---

- جفت ، Placenta

لە ساڵ دا مریشك جارێك یان دووان کڕ دەکەوێ؟ یان دەزانی هێندێك لە کەروێشکە مێیەکان بێچوە لاوازەکانی خۆیان دەخۆن، هەتا باشتر بەوانی تر ڕابگەن؟ بەڕای تۆ باشتر نیە ئەوان هەر لە سەرەتاوە نەهێڵن لە دایك بن هەتا ئەوەی بیان خۆن یان بە خواردنیان بدەن؟ من پێم باشترە نەیانبن. بەلاّم کاتێ بەڵگە دێنمەوە هاوڕێکەم توورە دەبێ و لە ولاّما دەڵێ حەب دەخوا بەلا لە مەجبوریان ئەم کارەی دەکاو پێی خۆش نیە و بە ناچاری ئەو کارەی دەکا. هەتاکو شەوێکیان لە بیری چووبوو حەب بخواو ئاکامەکەی هەڵکەندنی یەکەم کۆرپەلە بوو بە شتێك کە پێی دەڵێن سۆند. تێ ناگەم ئەم سۆندە چیە، وا بزانم میلە ئاسنێکە کە تەنیا دەکوژێ. بەلاّم دەزانم گەلێك ژن کەڵکی لێ وەردەگرن و ئاکامەکەشی ئازارێکی بێ بڕانەوە و زیندانە.

لەوانەیە لە خۆت بپرسی بۆچی چەند ڕۆژێکە لەم پێوەندیەدا دەگەڵت دەدوێم؟ بۆ خۆشم نازانم. لەوانەیە لە بەر ئەوەی خەڵکی تر زۆر لەم بارەوە دەگەڵم دەدوێن و ئازارم دەدەن بۆ ئەوەی لە کۆتایی دا رازیم بکەن ئەوەی ئەوان دەیڵێن بیکەم. لەوانەشە بێ ئەوەی دانم پێ دانابێ بیرم لەم کارە کردبێتەوە، لەوانەیە لە بەر ئەوە بێت کە نامەوێ کەس بکەمە شەریکی ئەم دوو دڵییەی دەرونم ئازار دەدا و نەخۆشی کردوە. بیری کوشتنت گەلێ ئازارم دەدا. بەلاّم جار جارە ئەمەم بە مێشك دا دێ. ئەم یاری بەو وشە کردنە لە مەڕ جووجەڵەکان دەمخاتە گێژاوەوە. هەروەها تووڕەیی هاورێکەشم، ئەو کاتەی وێنەکانتی نیشان دەدەم و ئاماژە بۆ دەست و چاوانت دەکەم. ئەویش دەڵێ بە مایکرۆسکۆپیش نابینرێن و بە سەرم دا دەگوڕێنێ و پێم دەڵێ من لە خەیاڵ دا دەژیم و دەمەوێ هەوێنی ژیری بەو هەست و خەونەکانم بدەم. تەنانەت پێی وتم " ئەی بۆچی کلکە تەشیەکانی حەوزی ماڵەوەتان دەردێنی هەتا بمرن و نەبنە بۆق بۆ ئەوەی شەوانە بە دەنگە دەنگیان خەبەرت نەکەنەوە؟ " دەزانم بێ پسانەوە باسی ئەو دنیا ئاڵۆزەت بۆ دەکەم کە ئامادەی هاتنی دەبی. ئاگاداری ئەو زوڵم و زۆرانەی ڕۆژانە دەکرێن دەکەمەوەو ، بیری ئاڵۆز و سەیرت بۆ باس دەکەم. بەلاّم دڵنیایەك وردە وردە لە لام دروست دەبێ. دڵنیایی لەوەی تێگەیشتوو دەبی، چونکە لە ئێستاوە شارەزای هەموو شتەکان دەبی. ئەم دۆخە ڕۆژێك هاتە بەرەوەو کە دەگەڵ بۆچوونەکانم کەوتمە کێشە بۆ ئەوەی بۆت روون بکەمەوە کە زەوی وەك تۆوێك کە لێی لە دایك دەبی خڕە و زەریاش وەك ئەو شلەیە دەچێ کە تێیدا دەژی. توانایی دەربڕینم نەبوو. کاتێ هەستم کرد هەوڵەکانم بێ ئاکامن، کە زانیم هەموو شتێك، ئەویش فرە باشتر لە من، دەزانی. ئەم گومانەشم لە خۆوە نەبوو. ئەگەر لە نێو ئەو تۆوەی کە لێی لە دایك دەبی دنیایەکی تێدایە ئەی بۆچی ئەندێشەشی تێدا نەبێ؟ بۆ مەگەر نەیانگوتوە نەست هەمان بیرەوەری ژیانە پێش لە هاتنە نێو ڕووناکی؟ ئایا بە ڕاستی وایە؟ کەواتە تۆ گشت شتێك دەزانی پێم بڵێ: ژیان کەی دەست پێ دەکا؟ لێت دەپاڕێمەوە ولاّمم بدەوە: ئایا تۆ دەستت پێ کردوە؟ لە کوێوە؟ لەو کاتەوە دڵۆپێك لە ڕووناکی کە پێی دەڵێن سپرماتوزویید چووە نێو هێلکەدانەوە؟ لەو کاتەوە دڵت دروست بوو و دەستی کرد بە هەڵێنجانی خوێن؟ لەو کاتەوە مێشکت پێك هات و وردە وردە شکڵی مرۆڤت بە خۆوە گرت؟ یان ئەو ساتەی هێشتا نەهاتووە و تۆ تەنیا مۆتۆرێکی لە بەر دەستی وەستادا؟ ئامادەم هەرچی هەمە بیبەخشم بۆ ئەوەی بێدەنگی تۆ بشکێنم و بچمە نێو ئەو زیندانەی تۆی لە خۆ گرتووە و من پارێزگاری لێدەکەم. ئامادەم هەرچی هەمە بیدەم بۆ ئەوەی بت بینم و گوێ بیستی ولاّمت بم!

من و تۆ جووتێکی سەیرین. هەموو شتێکی تۆ پێوەندی بە منەوە هەیە و، هەموو شتێکی من بە تۆوە. ئەگەر نەخۆش بکەوی، نەخۆش دەکەوم. ئەگەر بمرم تۆش دەمری. بەم حاڵەش نە من دەتوانم پێوەندیت پێوە بکەم، نە تۆش. سەرەڕای ئەوەی کە لەوانەیە زۆر ژیرو تێگەیشتوو بی نازانی روخسارم چۆنە و تەمەنم چەندەو، بە چ زمانێك دەدوێم. نازانی لە کوێ وە هاتووم لە کوێم، لە ژیانم دا خەریکی چیم. ئەگەر بتەوێ بمبینی چکۆلە ترین زانیاریت نیە بزانی ڕەشم یان سپی، گەنجم یان پیر، بەرزم یان کورت. منیش بە بەردەوامی ئەم پرسیارە لە خۆم دەکەم ئەتۆ مرۆڤی

یـان نـا. قـەت " دوو بێگانـە کـە چارەنووسـێکی هاوبەشـیان هـەبێ " بـە ڕادەی ئێمـە لێـك بێگانـە نـەبوون. قـەت " دوو نەناسیاوی یەکگرتوو لە جەستەیەك دا " پتر لە ئێمە نەناسیاوو، دوور لە یەك نەبوون.

*** *** ***

ئەمشەو خەوم نەبوو، لەجێگەکەم دا هەستم بە ئازار دەکرد! ئەتۆ نەبووی تووشـی ئـەم ئـازارو بێخەویـەت کـردم؟ بـە شێواوی و بێ تاقەتیەوە لە جێگەکەم دا تلم دەخـوارد و شـەو تـا بـەیانی خـەونی سـەیر سـەیرم دەدیـن. لـە خەونێکیانـدا باوکت دەگریا. قەت نەمدیبوو بگری. پێم وابوو ناتوانێ بگری. فرمێسکەکانی بە لێزمە لـە سـەر روومـەتی دەخلیسکان و دەڕژانە حەوزەکەی حەوشەوە، حەوزەکە پڕ بـوو لـە شـریتی بـاریکی درێـژی لـوول خـواردووی لـیچ. ئـەم شـریتانە تـۆوی وەك کلکی ڕەش و چکۆلەیان تێدابوو؛ ئەمانە بێچووە بۆق بوون. کارم بە باوکت نـەبوو. تـەنیا خـەریکی کوشـتنی بێچوە بۆقەکان بووم بۆ ئەوەی نەبنە بۆق و شەوانە بە قیڕە قیڕ لـە خـەو هـەڵم نەسـتێنن. کـارێکی ئاسـان بـوو هـەر ئەوەنـدەی دەویست شریتەکان دەربێنی و لە سەر شینایی قەراغ ئاوەکـەیان دانێـی هـەتا تیشکی خـۆر بیـانخنکێنێ. بـەڵام شـریتەکان دەخزان و لوولیان دەخوارد دەکەوتنـە نێـو لیتـە و قـەوزەی نێـو ئاوەکـەوە. نەمـدەتوانی ئـەم شـریتانە لـە سـەر سـەوزایی قـەراخ ئاوەکـە بەنـد بکـەم. باوکـت کۆتـایی بـە گریانەکـەی هێنـاو هاتـە یارمـەتی دانم. بـێ ئـەوەی خـۆی مانـدوو بکـا شـریتەکانی لـە سـەر سـەوزاییەکە بەنـد دەکـرد. بـە چـیلکە دارێکـی چووکە دانـە دانـە شـریتەکانی دەردێنـان و لـە سـەر سـەوزایی قـەراخ ئاوەکـە کـۆی دەکردنـەوە. وردە وردە خـەریکی ئـەم کـارە بـوو. منـیش هەسـتم بـە ئـازار دەکـرد چونکە شاهیدی کوژرانی دەیان هەزار کلکە تەشـی بـووم. بـە بزرکاویـەوە چیلکەکەم لـە دەسـتی دەرهێنـاو، بـە سـەرم دا قیژانـد: "لێیان گەڕێ با بژین بۆ تۆ بۆخۆشـت لـە دایـك نـەبوی! " لـە خـەوێکی دیکـەیانا کانگرۆیـەکم بینـی. کـانگرۆێکی مـێ لـە رەحمیەوە شتێکی نەرم و زیندوو هاتە دەرێ: کرمێکی سپی ناسك. بە سەرسوورماویەوە سەیری ئـەملاو ئـەو لای دەکـرد. دەتگوت دەیـەوێ بزانـێ لـە کوێیـە. وە سـەر لەشـی خـووری کانگرۆکـە هەڵگـەڕا. لـە سـەرەخۆ دەچـووە سـەر. دەخلیسـکا، ماندوو دەبوو، ڕێی ون دەکرد بەڵام ئاخرەکەی خۆی گەیانـدە کیسـەی بـەر زگـی دایکـی و، بـە لـەرزەوە لـە دوایـین هەوڵـدا خۆی لە کیسەکە هاویشت. ئەتۆ نەبووی، کۆرپەلەی کانگرۆ بـەم جـۆرە لـە دایـك دەبـێ. ئـەم کۆرپەلەیـە زوو لـە زینـدانی تۆو دێتە دەر و لە هـەوای ئـازاد دا فـۆرمی تـەواو دەبـێ. سـەرەڕای ئەمـەش دەگـەڵی دەدوام. دەتگـوت تـۆ بـووی. سوپاسـم دەکـرد کـە پـێم دەسـەلمێنی هەیـە. پـێم دەگـوت ئـیتر لێـك بێگانـە نـین ئـیتر نەناسـیاو نـین و لـە شـادی و خۆشـیان بـزەم دەنیشێتە سەر لێوان و پێدەکەنیم. بەڵام پیرێژنێك لەم کاتەدا گەیشتێ. زۆر پیرو غـەمین بـوو دەتگـوت قورسـایی هـەموو دنیای کەوتۆتـە سـەر شـانی و پشـتی چـەمابووەوە. کۆرپەلەیـەکی سـەر خـوارو خێچـی کەلـە خـەودا بـوو بـە سـەر دەسـتە چرچەکانیەوە بوو. دەیگوت: " گەلێ ماندووم . پارەی لە بـار بردنـی ئـەم کۆرپەیـە دەدەم. هەشـت جـار منـداڵم کەوتۆتـە سك و هەر هەشت جـار هـەڵم کەنـدوون. ئەگـەر دەوڵەمەنـد بـام شـانزە منـداڵم دەبـوون و قـەت هـەڵم نەدەکەنـدن. هـەر جارەی کە منداڵ هەڵدەکەنی وا دەزانی جاری یەکەمتە بەڵام قەشە ئەم قسانە نازانێ. " کۆرپەکە بـە قـەدەر یـەکێك لـەو خاچانە بوو کە بۆ هەڵگیران دەشێن. لـە کاتێکـا پیرێژنەکـە منداڵەکـەی وەك خاچـێك لـە سـەر دەسـتی بـوو چـووە ژووری کلیسا، پاشان لە یـەکێك لـە هۆدەکـانی دانـان بـە تـاوان دا چـۆکی دادان و دەسـتی کـرد بـە پارانـەوە. لـە ژووری هۆدەکـەوە دەنگێکی تووڕە هات. دەنگی قەشە: " ئەتۆ گیانلەبـەرێکت کووشـتوە! " دایـە گـەورە لـە ترسـی ئـەوەی خـەڵکی گوێیـان لێ نەبێ هەڵدەلەرزی. دەیگوت : " تکایە هاوار مەکەن باوکی پیرۆز، تکا دەکـەم! لەزینـدانم دەکـەن! تکـات لێ دەکـەم! " بـەڵام دەنگی قەشەکە هەروا بەرز بوو، هەر بۆیە ژنەکە ڕایکرد. بە کوچـەو کۆڵانانـدا رایـدەکرد و پاسـەوانەکان دوای دەکـەوتن. دیمەنی راکردنی ژنە پیرەکە جەرگ بڕ بوو. لە جیاتی ژنەکە هەستم بە لاوازی و کەمی دەکرد. لـە بـەر خۆمـەوە دەمـوت ئێستا دڵی رادەوەستێ و دەمرێ؛ پاسەوانەکان لە بەر دەرگای ماڵەکەی گەیشتنە سـەری منداڵەکـەیان لێ سـتاندو دەسـتیان

بەستن. پیرێژنەکە بە دەم سەر سوورمانەوە دەیگوت: " پەشیمانم، بەلاّم سەرلە نوێ ئەم کارە دەکەمەوە. قەت ئەم کارەم بە دڵی خۆم نەکردوە. بەلاّم ناتوانم بژیوی ئەم هەموو منداڵە پەیدا بکەم. " لەم کاتەدا بوو لە بەر ئازارو ژانی سکم لە خەو هەڵستام.

چی تر ناچمە زیارەتی هاورێکەم. ئەم قسانەی ئەوە تووشی ئەم خەوانەم دەکا. دوێ شەو بانگ هێشتی کردم. مێردەکەی لە ماڵەوە نەبوو. ئەویش ئەمەی بە هەل زانی لە بارەی تۆوە قسان بکەین. زۆری نارەحەت کرم. پێدەچوو دەگەڵ دوکتورێك بە ناوی هـ . ب . مونسون یەك بڕوایان هەبوو. بە قسەی ئەو کۆرپەلە بێجگە لە ماددەیەکی بێ گیان کە وەك بنچکە گیایەك دەری بهێنی شتێکی تر نیە. لەوپەڕی تەواویەتی خۆیدا دەکرێ بڵێین " نیزامێکی هاوئاهەنگە کە هەلی بە ئاکام گەیشتنی نەبووە." بە ڕای هێندێك لە زیندەوەرزانەکان بە پێچەوانەوە بوونی مرۆڤ لە هەمان سەرەتای یەك گرتنی تۆوەکانە چونکە تۆوی پیتراو (DNA )ی تێدایە. هەمان ئەسیدزۆکسی ریبونوکلئیك کە بنچینەی هەموو پرۆتینەکانە کە مرۆڤی لێ دروست دەبێ. دوکتور مونسون لە وەلاّمی ئەم بۆچونەدا دەڵێ کە ئیپرماتوزیید و تۆوی نەپیتراویش DNA یان تێدایە؛ کەواتە دەکرێ تۆوی ئیسپرما توزییدیش بە مرۆڤ دانێین؟ کۆمەڵێ دوکتور هەن لە سەر ئەو بڕوایەن مرۆ پاش 24 حەوتوو دەبێتە ئینسان؛ واتە ئەو کاتەی کۆرپەکە دەتوانێ، سەرەڕای کامڵ نەبوونی سووری منداڵ، کە لە دایك بوو دەتوانێ درێژە بە ژیانی بدا. هەروەها تاقمێك مرۆناسیش هەن پێیان وایە کۆرپەلە بە مرۆ حیساب ناکرێ چونکە هێشتا کاریگەری کولتوورو کۆمەڵگای بە خۆوە نەگرتووە. کێشەمان لێ پەیدا بوو و، تووشی دەمە تەقە بووین. هاورێکەم دەگەڵ ڕای مرۆ ناسەکان بوو و منی بەوە تاوانبار دەکرد دەگەڵ ڕای قەشەکانم. وتی: "ئەتۆ کاتولیکی، کاتۆلیك ! " پێم ناخۆش بوو. من کاتولیك نیم ئەویش ئەمە دەزانێ. من دژی دەست تێوەردانی قەشەکانم لەم جۆرە کارانەدا، ئەمەش باش دەزانێ. بەلاّم من قەت ناتوانم یاسای دروست کراوی دەستی دوکتور مونسون پەسند بکەم. ناتوانم قەناعەت بە خۆم بێنم ئینسان بتوانێ سۆند لە خۆی ڕۆبکا هەتا پاش ماوەی پیسایی یان خوارنێکی قورس فڕێ بدا. مەگەر ئەوەی کە...

مەگەر ئەوە کە چی؟ دەمەوێ خیانەت بە خۆم بکەم؟ پێم وابوو بە رادەی پیویست دڵنیا بووم و، بە سەر دڵە خورپەکانم دا زاڵ بووم. ئەی بۆچی هەنوکە هەزار جۆر بڕو بیانوو سەر رێگەیان پێ گرتووم؟ ئایا لە بەر ئەم نارەحەتیەیە توشی سەرە گێژەی کردووم؟ یان لە بەر ئەو هەموو ژانەیە وەك بروسك بە زگم دا دێن؟ بچکۆلە گیان، دەبێ بەهێز بم. دەبێ ئیمانم بە تۆو بە خۆم بپارێزم. بە کورتی هەتا تۆ لە دایك دەبی پارێزگاریت لێ دەکەم. هەتا ئەو کاتەی گەورە بووی نەبیتە ئەو قەشەیەی لە خەوەکەما هاواری دەکرد. نەبیتە هاورێیەکەم و دوکتور مونسونی ئازیزی. نەبیتە ئەو پاسەوانەی دەستی پیرێژنی لە پشتەوەڕا بەست. یەکەم دانەیان ئەتۆ بە هی خودا دەزانێ، دوهەم دانەیان ئەتۆ بە هی دایکت دەزانێ. ئەوانی دیکەش بە ملکی دەوڵەتت دادەنێن. ئەتۆ نە هی خودای نە هی دەوڵەت و نەهی من. ئەتۆ هی خۆتی. هەر چۆنێکی بێ بۆخۆت ئەم کارەت بە دەستەوە گرتووە و من بە هەڵە پێم وابوو هەڵبژاردنێکم پێ سەپاندوویی. بە ڕاگرتن و پاراستنت تەنیا پێرەوی لە فرمانێك دەکەم ئەو کاتەی تروسکایی ژیانت هەڵبوو. من هیچم هەڵنەبژاردوە تەنیا مل کەچی یاسایەکم. لە نێوان من و تۆدا ئەوەی لەوانەیە فیدا بێ ئەوە منم تۆ نی. بۆچی ئەو کاتانەی وەك شەم شەمەکوێرە خۆم پێوە هەڵدەواسی مەبەستت تەنیا ئەمە نیە؟ ئەو کاتەی تووشی رشانەوەم دەکەی ناتەوێ ئەمە بسەلمێنی؟ تەندروستیم باش نیە. ئێستا ماوەی حەوتوویەك دەبێ کارەکەم ماندووم دەکا. لاقێکم ئەستوور بووە. کارێکی گەلێ ترسناك دەکەم ئەگەر ئەو سەفەری بۆم ئامادە کراوە نەچم و، چاوپۆشی لێ بکەم . بەرپوەبەرەکەشم ئەمە دەزانێ. ئەمرۆکە لە قسەکانی دا کە کەم و زۆر بۆنی هەڕەشە کردنیان لێ دەهات، وتی: "دەتوانی بچی! " و وتی پێی خۆشە بتوانم ئەم سەفەرە بکەم. پلانێکی گرنگ لە گۆڕێدایە کە کارەکەی بۆ من گونجاو، لەبارە. گرنگێکی زۆری

بۆ دادەنێ و، منیش هەروەها، ئەگەر نەتوانم بچم... بێ شك دەچم. دوكتور وتوویەتی سك پڕی نەخۆشی نیە و دۆخێكی بەتەواوی سروشتیە؛ دوكتور وتوویەتی دەتوانم هەمان ئەو كارانەی پێشتر كردوومن ئێستاش بیان كەم؟ ئەتۆ خیانەتم پێ ناكەی.

*** *** ***

شتێك روویدا پێش بینیم نەكردبوو : دوكتور خستمی و ئێستا جوولانم بۆ ناكرێ. دوكتور بۆی داناوم راكشێم و نەجوڵێم: كارێكی ئاسان نیە، دەزانی؟ چونكە من بە تەنیا دەژیم. ئەگەر كەسێك لە دەرگا بدا دەبێ هەڵستم و دەرگای بكەمەوە. دەبێ نانیش بخۆم. هەتا خواردنم ساز كرد دەبێ خۆم بشۆم. بە گشتی ناچارم لە جێگە بێمە دەر و خەریكی كار بم، وا نیە؟ هاوڕێیەكەم یارمەتیم دەدا. كلیلی ماڵەكەمی پێیە رۆژی دوو جار خواردنم بۆ ساز دەكا. دوێنێ پێم وت: " منداڵی سێهەمت نەویست ئێستا منداڵێكی گەورەترت بە توشەوە بووە. " لە وەڵام دا وتی گەورە ساڵ باشترە لە ساوا؛ پێویست ناكا شیری بدەیتێ. بڕوام پێدەكەی ئەگەر بڵێم هاوڕێیەكەم ئینسانێكی باشە؟ زۆر باش و میهرەبانە. ئەوە لە بەر ئەوە نیە پێم ڕادەگا و یارمەتیم دەدا بەڵكو لە بەر ئەوەیە چی تر باسی دوكتور مونسون و مرۆناسەكانم بۆ ناكا. دەڵێی تۆم لە دەست داوە واتووشی وەحشەت بووە. ترسێك لە گۆڕێ دا نیە: " دوكتور لە ئەنجامی ئاخرین تاقی كاری دا پێی وتم نیگەران نەبم تەندروستیت باشە و گەورە دەبی ". ئەو تەنیا لە بەر ئەوە ئیحتیات بكەم پێی وتم نەجووڵێم هەتا ئازاری زگم، كە هۆی جۆراوجۆری هەن، نەمێنێ. ئێستاكە تۆدوو مانگانەی ئەم قۆناغە قۆناغێكی ناسكە: لەم ماوەیەدا نووتفە دەبێ بە كۆرپەلە. یەكەمین خانەكانی ئێسقانت دروست دەبن و جێگەی كرِكرەكان دەگرنەوە. لاقەكانت وەك لقی دارەكان گەورە دەبن و پەنجەكانت وەك گڵوك دەپشكون. هەتا دەبی بە سێ مانگ دەبێ لە سەرەخۆ بم پاشان دەگەڕێمەوە دۆخی جاران: ئەم نەجولان و پارێزە پانزدە ڕۆژ زیاتر درێژەی نابێ. بە بیانووی جۆراوجۆر بەرپێوەبەرم ڕازی كرد كە دەتوانرێ سەفەرەكە دوا بخرێ، پێم وت دەبێ گەلاڵەو پلانی بۆ دارێژم. چەند باشتر دەبوو ئەگەر ڕاستیەكەی زانیبا، لەوانەبوو یەكی تر لە جێگەی من بۆ ئەم سەفەرە بنێرێ لەوانەش بوو داوای لێبوردن بكا. ئەو كاتە من و تۆ تووشی كێشە دەبووین. كێ نانی پێ دەداین؟ بە ڕاستی ماوەیەكە هەواڵێك لە باوكتەوە بە من نەگەیشتووە. وابزانم حەز نەكا تووشی كێشە بێ؟ پێت ناخۆشە؟ من وا نیم: ئەو بڕە هەستەی بەرامبەری هەمبوو بە دوو قسە كردن لە سەر تەلەفۆن نەما. لە هەمووان گرنگتر لە جیاتی ئەوەی بێ و سەردانم بكا بە تەلەفۆن قسەم دەگەڵ دەكا، هەر چۆنێكی بێ كاتێ دەگەڕا یەوە دەیتوانی سەردانم بكا. ئەتۆش پێت وا نیە؟ ئەو باش دەزانێ داوای لێناكەم مارەم بكا. قەتیش ئەمەم لێ نەویستووە. چونكە نامەوێت مێردی بكەم. كەواتە چی دەبێتە هۆی نەهاتنی؟ لەوانەیە هەست بە تاوان بكا. ئەو لە سەر جێگەیەك دەگەڵم نووستووەو خۆشەویستی كردوە. ڕۆژێكی پیرێژنێك چوو بۆ كلیسا ددان بە تاوانەكانی دا بنێ قەشەكە پێی وت: " دەگەڵ مێردەكەی خۆت مەخەوە. لە ڕاستی دا بە ڕای هێندێكان تاوانی ژن و پیاو لەوە دایە بە یەكەوە دەخەون. ئەوان دەڵێن بۆ ئەوەی منداڵت نەبێ هەر ئەوەندە بەسە پاكی و پاك داوێنی بپارێزین؛ باشە: بەڵام ئەمە گەلێ ئەستەمە لێكی جیا بكەینەوە كێ تاوانی هەیە و كێ نیەتی. وەرن با گشتمان پاكی بپارێزین و ببینە مرۆڤی پیرو پەككەوتە. ببینە هەزاران هەزار پیرە پیاو و پیرێژن لە سەر ئەم دنیایە. ببینە هەزاران هەزار پیرە پیاو و پیرێژن كەزاوزێیان پێ خۆش نیە. لێرەدایە ڕەگەزی مرۆ بەرەو لەناو چوون دەچێ. وەك چیرۆكە زانستی – خەیاڵیەكان كە لە سەر ئەستێرەی مەریخ ڕوو دەدەن یان لەو شارە سەیرانەی كە لە بەر كۆنی و خراپی تێك دەتەپێن و تەنیا رووحەكان لەوێدا دەژین. رووحی گشت ئەو كەسانەی كە دەیانتوانی لە دایك ببن و نەبوون. رووحی ئەو منداڵانەی قەت لە دایك نەبوون. یان با گشتمان ببینە هاو جنس باز چونكە ئاكامەكەی یەكسان دەبێ:

ئەستێرەیەك هەمو ئینسانەکانی پیرو داماو و پەك کەوتە و بێزار لە زاوزێ لەو شارە سەیرانەی لە بەر کۆنییان بەرەو وێران بوون دەچن و تەنیا رووحی ئەو منداڵانەی قەت لە دایك نەبوون لەوێدا دەژین...

لەوانەشە بە پیچەوانەوە بێ و بتوانرێ کەڵك لەم پیرانە وەربگیرێ. لە ڕۆژنامەیەك دا خوێندمەوە کە دەتوانرێ کۆرپەلە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر بگوێزرێتەوە. سەرکەوتنێکی بایولۆژی – تیکنۆلۆژی! تۆوی پیتراو لە هێلکەدانەی ژن دەردێنن و لە هێلکەدانەی ژنێکی تردا دای دەنێن. دیارە بە ڕەزامەندی ژنەکە. ئەم تۆوە لە لای ئەم ژنە گەورە دەبێ. سەیرکە ئەگەر ژنێکی تر وە خۆی گرتبای، بۆ وێنە ژنێکی پیر کە لە نێو جێگەی مانەوەی دا ژان کێشان و عەزاب نەبێ. تۆ هەر لە دایك دەبووی و منیش تووشی ئەم ئازارە نەدەبووم. لە ڕاستی دا منداڵ دروست کردن کاری پیرەکانە. پیرەکان تاقەتی باشیان هەیە. لەوانەیە پێت بێ حوورمەتی کردن بێ بۆ زگی ژنێکی تر بگوێزدرێتەوە. بۆ زگێکی باش کە ساردی و گەرمی ڕۆژگاری چەشتبێ و قەت ئیرادت لێ نەگرێ. بۆ دەبێ پێت بێ حوورمەتی بێ؟ خۆ ژیانت لێ ناستێنم. تەنیا ماڵێکی ترت بۆ دابین دەکەم. بم بوورە وڕێنەی دەکەم. هۆیەکەی ئەوەیە کە ناجووڵێم و، نەجوولانیش عەسەبی و بەدخووم دەکا.

*** *** ***

ئەمڕۆ شتێکی خۆش روویدا تەلەفۆنیان کردو لە جێگە هاتمە دەر. پۆست چی بوو. بەستەیەکی پێ بوو کە لە لایەن دایکمەوە دەگەڵ نامەیەك کە ئیمزای باوکمی پێو بوو هاتبوو. چەند ڕۆژ لەمەوبەر بوونی تۆم پێ ڕاگەیاندن. پێم وابوو ئەمە ئەرکەو دەبێ ئەوان ئاگادار بکەم. لە ماوەی ئەم چەند ڕۆژەدا هەموو بەیانییەك بە حەژمەتەوە چاوەڕوانی وەڵامیانم دەکرد. پێم وابوو وەڵامێکی ناخۆش دەنێرنەوە بۆیە ترسم لە دڵ دا بوو. ئاخر ئەوان دوو مرۆن بە مۆدی کۆن، تۆ ئەمە دەزانی؟ بەڵام ئەم نامەیە بە پیچەوانەوە بوو. ئەوان وێڕای سەر سووڕمانیان شادن و قەدەمت بەخێر هاتن دەکەن: " ئێمە ئیتر دوو داری وشك بووین و ، هیچمان پێ نیە فێری تۆی بکەین. ئێستا تۆ دەبێ ئێمە ڕێنوینی بکەی. ئەگەر بڕیارت داوە ئەمە دەگەیەنی بڕیارەکەی خۆت ڕاستە. ئەم نامەیە بۆیە دەنووسین ئامۆژگارییەکانت پەسند دەکەین. " پاش خوێندنەوەی نامەکە. بەستەکەم کردەوە. قووتوویەکی پەلاستیکی سپی چکۆلەی تێدا بوو کە جوتێك پێڵاوی سپی چووکی تێدا بوون. چکۆلە و سووك و سپی. یەکەمین کەوشەکانت. لە سەر بەری دەست جێگەیان دەبۆوە؛ بگرە چکۆلەتریشن. کە دەستیان لێدەدەم ئەوکم پڕ دەبێ لە گریان و بێ تاقەت دەبم. بێ شك دایکمت خۆش گەرەك دەبێ. دوو دایکت دەبن، ئەمەش سەروەتە. خۆشت دەوێ چونکە ئەو پێی وایە بێ بوونی منداڵ دنیا کۆتایی دێ. خۆشت دەوێ چونکە قەڵەو دڵسۆزە. زگێکی پان و نەرمی هەیە خۆشە لە سەری دانیشی؛ دوو دەستی گۆشتنی هەن تێیان دا ون دەبی. دەنگێکی هەیە دەڵێی زەنگووڵەیە دەزرینگێتەوە. لە نەهێنی پێکەنینی نەگەیشتووم. بەڵام پێم وایە لە ژیانی دا زۆر گریاوە. تەنیا ئەوانەی زۆر گریاون نرخی جوانیەکانی ژیان دەزانن و لە دڵەوە پێدەکەنن. گریان ئاسانە، پێکەنین سەختە. بە زوویی لەم ڕاستیە دەگەی. یەکەمین پێوەندیت دەگەڵ دنیا گریانێکی ناهومێدانە دەبێ. لە سەرەتا دا جیا لە گریان چی ترت لە دەست نایە. هەموو شتێك دەتگرێنێ. شۆق، برسییەتی، تووڕە بوون، حەوتوو، مانگەکان پێ دەچێ هەتا یەکەمین بزە بێتە سەر لێوانت و ئەوکت بە پێکەنین بلەرزێ. بەڵام نابێ بێ هیوا بی کاتێ بزەت هات، کاتێ پێکەنیت هات دەبێ پێشکەش بە منیان بکەی: هەتا پێم بسەلمێنی کارێکی باشم کردوە کە لە بایلۆژی_ تێکنۆلۆژی کەڵکم وەرنەگرتووەو، زگی دایکێکی بە تاقەت و، باشتر لە خۆم نەکردە دیاری بۆ تۆ.

*** *** ***

وێنەکەتم کە دوو مانگانەیە لە رۆژنامە بڕیوە: وێنەی روخسارتە کە چل کەرەت گەورە کراوەتەوە و لە دیوارم داوە. لە سەر تەختەکەمەوە سەیری دەکەم. ئەفسوون و خولیای چاوەکانت بووم کە لە چاو جەستەت گەورەترن و کراوەن.

ئەوان چی دەبینن؟ ئاو؟ تەنیا دیوارەکانی زیندانەکەت؟ یان ئەو شتانەی کە منیش دەیانبینم. شکێکی سەیرم کەوتۆتە مێشکەوە: شکی ئەوە چاوانت لە نێو زگمەوە دەتوانن شت ببینن. لەوە کە بەم زوانە چاوانت لێك دەنێیتەوە دڵ تەنگم. لە قەراخ پێلوەکانت ماددەیەکی خەمیری لێ وەدەر دەکەویٚ هەتا چەند ڕۆژی تر چاوانت پێکەوە دەنووسێنیٚ بۆ ئەوەی پارێزگاری لە ڕەشکێنەی چاوت بکا کە لە ماوەی گەشەو کامڵ بوون دایە. هەتا حەوت مانگی چاوت ناکەیتەوە بیست حەوتوو لە تاریکی ڕەها دا دەبی! مەخابن، بەلاّم لەوانەیە واش نەبیٚ؟ کاتیٚ هیچت بۆ بینین نیە باشترە گویٚ بۆ قسەکانی من ڕادێری. هێشتا زۆر شت هەن پێت بڵێم و ئەم ڕۆژانە کە لە جێگەدا کەوتووم هەلێکی باشە. چونکە تەنیا کارم خوێندنەوەیە و سەیری تەلەفزیۆن دەکەم. لە هەمووان گرنگتر دەبیٚ تۆ ئامادەی ئەو ڕاستیە تالأنە بکەم کە دێنە سەر ڕێت. بەمە هیوادار نیم تۆ ئیستا هەمووشتێك دەزانی. بەلاّم ڕوونکردنەوەی هێندێك شت گرانە. چونکە ئەگەر بۆ خۆت لە نێو ڕاستیەکانا بایەی شتەکانت باشتر هەست دەکرد و، دەتزانی ئەوەی دەوتریٚ چەندە پێچەوانەی ئەوەی ڕوودەدا یان دەیلێن. ئەتۆ تەنیایی. تەنیایەکی سەربەرزانە. یەکەم ئەزمونت خۆتی. بەلاّم ئێمە لە بەرامبەر ئەزمونی خۆماندا بیٚ ئەژمارین: هەزاران هەزارئەزمون. ئەزمونی هەر یەکەمان پێوەندی بەوانی ترەوەو هەیە. شادیەکانمان، ئازارەکانمان،...

باشە با لێرەوەو دەست پیٚ بکەین. پێت ڕادەگەیەنم کە ئیتر لەم دنیایەی چاوت پێی دەپشکویٚ بە تەنیا نابی. ئەگەر بتەویٚ خۆت لە چرو چاوی سەپاو، ئەوەی هەموو ڕۆژیٚ دەیبینیەوە، ڕزگاری بکەی سەرکەوتوو نابی. لە دنیادا هیچ کەس بە تەنیا وەك تۆ ناتوانیٚ پێداویستیەکانی دەستەبەر بکا. ئەگەر هەوڵیش بدا شێت دەبیٚ دەنا لە باشترین حاڵەت دا لە کارەکەیا تێك دەشکیٚ. جار جارە کەسێك پەیدا دەبیٚ خۆی تاقی دەکاتەوە. ڕوو لە دارستان و دەریا دەکا، سوێند دەخوا پێویستی بە کەس نیە و پێی وایە ئیتر ئەوە دەست بەرداری دەبن و نایدۆزنەوە. بەلاّم دەیدۆزنەوەو بگرە بۆ خۆشی دەگەڕێتەوە. بە تێك شکاوی دەگەڕێتەوە جێگەی خۆی هێلانەی مێروەکان، بۆ نێوان ددانی چەرخەکان: هەتا بە سەرگەردانیەوە و، بیٚ دەسکەوت بە دوای ئازادی دا بگەڕیٚ. لە سەر ئازادی قسەی زۆرت گویٚ لیٚ دەبیٚ لێرە لە لای ئێمە ئەم وشەیە بە ڕادەی وشەی ئەوین پێشێل کراوە. هەروەك پێشتریش باسم کرد لە هەموان زۆرتر پیٚشێلمان کردوە. پیاوی وا دەبینی لە بەر ئازادی سەرو ماڵیان تێدا دەبەن ئەشکەنجەکان تەحەموول دەکەن، ئامێز بۆ مەرگ دەگرنەوە. هیوادارم تۆش یەکێك بی لەوان: سەرەڕای ئەوەی کە بۆ ئازادی هەوڵ دەدەی و تێدا دەچی دەزانی واتایەکی وا وجوودی نیە، ئەوەی هەبووە تەنیا: خەونێك بووە، خەیاڵێکی لە دایك بووی بیرەوەری ژیانی پێش لە دایك بوونت، ئەو کاتەی ئازاد بووی، چونکە تەنیا بووی. دووبارەی دەکەمەوە ئەتۆ لە زگی منا زیندانی، دەزانم جێگەت تەنگە، بەلاّم لەمە بە دواوەش لە تاریکی دا ژیان دەبەیتە سەر: بەلاّم لەم تاریکیەدا لەم جێگە تەسکەدا ئەوەندە ئازادو سەربەستی کە قەت ئەم ئازادی و سەربەستیەت لەم دنیا پان و گەورەیەدا بە دەست ناهێنێتەوە. لە لای تۆ پێویست ناکا داوای لێبوردن و یارمەتی لە کەس بکەی. چونکە کەس لە لات نیە. ئاگاداری دیلیەکان نی. لێرە لەم دنیایەدا بە پێچەوانەوە هەزار ئاغاو و کوێخات هەن. من یەکەمین ئاغام. چونکە نەخوازراو لە ڕووی نەزانیەوە زۆر شتت بە سەردا دەسەپێنم کە بۆ من باشن نەك بۆ تۆ. بۆ وێنە ئەم کەوشە چکۆلانە؛ من پێم جوانن. ئەی ئەتۆ چۆن؟ کاتیٚ دەیپێت دەکەم دەگری و دەقیژێنی. دڵنیام توورەت دەکەم، بەلاّم بەم هەڵس وکەوتانە ڕادێی. ڕادێی وات لیٚ دیٚ ئەگەر کەوشەکان لە پێت نەبیٚ نازانی بڕۆی، خوی پیٚ دەگری. ئەمەش سەرەتای زنجیری یەخسیری دیل بوونت دەبیٚ. سەری ئەم زنجیرە بە دەستی منەوە دەبیٚ چونکە تۆ پێویستت بە منە. پێویستت بە منە بتشۆم نانت بدەمیٚ و لە ئامێزت بگرم و بت بەم بۆ گەڕان پاشان کە گەورەتر بووی بیٚ من دەڕۆی، بیٚ من نان دەخۆی، بیٚ من بڕیار دەدەی بۆ کویٚ بچی و کەی دەموچاوت بشۆری. بەلاّم ئەو کاتەش شێوەی دیل کردنی نویٚ دێنە گۆڕیٚ. ڕێنوێنی و ئامۆژگارییەکان، ترسی خۆت لەوەی

نەمرِەنجێنی کە کارێ بکەی پیچەوانەی ویستی مـن بـێ. ماوەیـەکی زۆری دەوێ هـەتا بـێلم سەربەسـت بـی وەك بێچوە پاساری کە کـاتی بالـه فـرە دەبـێ دایـك و بـاوکی دەی هێننـە گـوێی هێلانـەو، بـەری دەدەنـەوە. سـەرەنجام ئـەو رۆژە دەگـا ئیزنت بدەم لە مالێ بچیتە دەر ئیزنت بـدەم لـە چـرای سـووری سـەر شـەقام بپەرِیتـەوە و، یارمـەتیت دەدەم. بـەلام ئەمـە شتێك بە ئازادییەکەتەوە زیاد ناکا. چونکە تۆ دیلی ئـۆگری و دلسۆزیەکانمی. ئـەو شـتانەی کـە پییـان دەلـێن بەربەسـتی بنەمالە. من بروام بە بنەمالە نیە. بنەمالە دروستکراوی دەستی ئـەو کەسـانەیە تەشـکیلاتی ئـەم دنیایـەیان دامەزرانـدوە بۆ ئەوەی بە باشی بە سەری دا زالێ بن ئەوان سوودێکی گەلێ زۆر لە گوێ رایەلی و ئەفسانەکان وەردەگـرن. مـرۆ کـاتێ بـە تەنیایە باشتر پێ دەگاو کاتێ دەگەلێ خـەلکی تـرە ئاسـانتر مـل بـۆ قـەزاو قـەدەر درێـژ دەکا. بنەمالـە جیـا لـە میکرفـۆنی نیزامـی کـە ئیزنـت نـادا بـە ویسـتی خـۆت بـی شـتێکی تـر نیـە و، پـیرۆز بوونەکـەی بـوونی دەرەکـی نیـە. ئـەوەی هەیـە کۆمەلێکن پێك هاتوو لە ژن و پیاو کە وا داندراوە هاو ناوبانگ بن و لە ژێر یەك سێبەردا بـژین: ئـەویش زۆرتـر لـە بـەر بێزاری و نارازی بوون لە یەکتری. سەرەرای ئەمانەش هێندێك پێوەندی هەن وەك ئەو دارانـەی لـە بەرامبـەر گـەردەلوول دا خـۆ رادەگـرن لـە نێـو ئێمـەدا رەگ و ریشـەیان داکوتـاوەو، وەك برسـییەتی و تینویـەتی حاشـایان لێ نـاکرێ بـە هـەموو هێزو ئیرادەو ژیاریمانەوە لە دەستیان رزگاریمان نابێ. پێت وایە لە بیرت چۆتەوە، بـەلام رۆژێکـی سـەیر دەکـەی سـەر لـە نوێ سەریان هەلدوەتەوە هەتا بێ بەزەییانەتر لە هەر دوژمنێك پەتی خنکانیان لە مل بکەن و بیان خنکێنن.

سەرەرای ئەو کۆیلەیی و دیلیانەی باسمان کردن، گەلێ جۆر کۆیلە بونی تریش دێنە سەر رێت: کۆیلە بـوون لـە جـۆری دانیشتووانی شارە مێرووەکـان. خـوو و، یاسـاکانیان. لـە عـەقلێ دا نـاگونجێ نـاتوانی لاسـای عادەتـەکانیان بکەیـەوە و، وەك وان رێـز لـە یاسـاکانیان بگـری. ئـەم کـارەی مەکـە ئەمـەی والێبکـە،... ئـەم دۆخـە کـاتێ تەحـەموول دەکـرێ کـە لـە نێـو خەلکێکی دلسۆز دا بژی کە شارەزاییان لە چەمکی ئازادی هەیە؛ بەلام کاتێ لـە ژێـر کـۆت و زوولمـی ئـەو زالمانـەدا دەژی کە ناهێلن تەنانەت بیر لە ئازادی بکەیەوە، ئیدی لێرەدایە ژیان دەبێتە دۆزەخ. یاسا سـەپێنراوەکان تـەنیا یـەك قازانجیـان هەیە: بەرەنگار بوونەوەیان لە رێگەی مەرگەوە. بـە پێچەوانەوە یاسـای خـەلکی دلسـۆز رێگـەی دەربـاز بـون پیشـان نـادا چونکە خۆت رازی دەکەی کە پەسـند کردنیـان کـارێکی باشـە. لـە هـەر نیزامێـك دا بـژی نـاتوانی بـەرەنگاری ئـەو یاسـایە بکەی کە تێیـدا هـاتووە بـە هێزتـرین و بـێ رەحـم تـرین هـەردەم دەبـێ سـەرکەوتوو بـێ. لەوەش سـەختتر، نـاتوانی دژی یاسایەك بوەستی کە دەلێ بۆ نان خواردن دەبێ پارە بدەی بۆ خەوتن دەبێ پارە بدەی. بۆ خـۆ گـەرم کردنـەوە لـە زسـتان دا دەبێ پارە بـدەی و، بـۆ ئـەوەی پـارەت هـەبێ دەبـێ کـار بکـەی. سـەبارەت بـە پێویسـتی کـار، سـەبارەت بـە خۆشـی کـار، سەبارەت بە رێزی کار، گەلێ چیرۆکت گوێ لێ دەبن؛ قـەت بروایـان پـێ مەکـە. ئـەم درۆیانـە هـی ئـەو کەسـانەیە سـازمانی دنیایان دارِشتووە. کار بێگارییە، ئەگەر حەزیشت لێ بێ. هەمیشـە بـۆ کەسـێکی تـر کـار دەکـەی نـەك بـۆ خـۆت. هەمیشـە ماندوو بێ تاقەتی و خۆشی رووت تێ ناکا. قەت وا نابێ حەزت لە کار بێ ئەگـەر هەلکـەوت بـۆ کارەکـەت کـارت بـە کـەس نـەبوو، وەك کێلانـی زەوی دوبـارە پێویسـت بـە هـەتاو و بارانـە و، وەرزەکـان کارەکـەت بـۆ دیـاری دەکـەن. کەواتـە قـەت هەلناکەوێ سەربەست بی. ئەگەر هوونەرمەند بی کە هەناسەیەکی سەربەسـتی و ئـازادی تێدایـە چـارەت نیـە دەبـێ وردە فەرمایش و سووکایەتی پێکردنی هێندێکیان قەبوولێ بکەی. لەوانەیە لـە رابردوویـەکی گـەلێ دوور ئەوەنـدە دوور کـە بـیر نایـەت کـەی بـووە ئـاوا نـەبووبێ و، کـار وەك رێ و رەسمێـك و، شـادی گێـران بـووبێ. ئـەو کاتـە حەشـیمەت کـەمتر بـوو دەتتوانی خۆ لە کار لا بدەی. ئەتۆ هەزار و نۆسەدو حەفتاو پێنـج سالێ پـاش پیاوێـك لـە دایـك دەبـی کـە نـاوی مەسـیحە. ئەو پیاوەی بۆ خۆی سەدان هەزار سالێ لە پاش پیاوێك لە دایـك بـوو کـە کـەس نـاوی نـازانێ و ، لـە سـەردەمی ئێمـەش دا هەر بەم روالەتە دەبێ. سەرژمێرییەکی نوێ دەلـێ ژمارەمـان بۆتـە چـوار ملیـارد. ئـەتۆ هـەنگاو دەنێیتـە ئـەم کۆمەلەیـە. بچکۆلە: سەد خۆزگە بە خۆت بە تەنیا چێژ لەو تەنیاییەی وەردەگری کە تێیدای.

*** *** ***

سێ چیرۆکم بۆ نووسیوی. لە ڕاستی دا نەم نووسیون چونکە بەم حاڵە کە ڕاکشاوم ناتوانم بنووسم، بەلاّم لە بیرم دا گەلاّڵەم کردون. یەکەم دانەیانت بۆ دەگێڕمەوە. هەبوو نەبوو کچۆلەیەکی چکۆلە هەبوو، خولیای داری ماگنولیا بوو بوو. ماگنولیا یان لە نێوەڕاستی حەوشە دا چاندبوو و، کچۆڵەکە بەیانی هەتا ئێوارەێی بە سەیر کردنی ئەم دارە تێپەر دەکرد. لە قاتی سەرەوەڕا سەیری دەکرد. چونکە لە قاتی سەرەوەی ئەو ماڵە دا دەژیا کە بە سەر حەوشەکەدا زاڵ بوو. کچەکە لە تەنیا پەنجەرەیەك کە رووی لەم لایە بوو سەیری دارەکەی دەکرد. ئەو بۆ سەیر کردنی ماگنولیا ناچار بوو چرپایەك لە ژێر پێی دانێ بۆ ئەوەی بگاتە پەنجەرەکە. کاتێ دایکی ئەمەی دەزانی هاواری دەکرد: " خودایە گیان کچەکەم نەکەوێتە خوار! " ماگنولیا گەورە بوو، لقی گەورەی هەبوون و، گوڵی گەورە کە وەك تارای خاوێن کرابوونەوە بە لقەکانەوە بوون؛ کەس ئەم گولاّنەی لێنەدەکردنەوە چونکە کەس دەستی نەدەگەیشتێ. بۆیە گوڵەکان هەتا سیس و زەرد دەبوون و بە سووکە بایەك هەڵدەوەرین بە لقەکانەوە دەمانەوە. کچۆڵەکە لە بیری ئەوەدا بوو ئاخرەکەی کەسێ هەڵدەکەوێ گوڵێکی لێ بکاتەوە کە هێشتا سپییە، لەم بیرانەدا نقووم لە قەراخ پەنجەرەکە وەستابوو! قۆڵی لە قەراخ نەردەی پەنجەرەکە و چەنەگەی لە سەر قۆڵی بوو. لە چوار دەوری ئەم خانووە خانووی تری لێ نەبوون. تەنیا دیوارێکی بەرزو راست بوو چوار دەوری باخەکەی دەگرت و، دەگەیشتە سەیوانێك کە جل و بەرگی شۆراو بە تەنافێکەو هەڵواسرابوون. جل و بەرگە هەڵخراوەکان بە با، وە شەقە شەق کەوتبوون پێ دەچوو وشك بوو بوونەوە. لەو کاتەدا ژنێك هات و لێی کردنەوە و خستنیە زەمبیلەیەك و ڕۆیشت. بەلاّم ڕۆژێکیان هەمان ژن هات و لە جیاتی لێکردنەوەی جل و بەرگەکان نیگای لە مەنگولیا ڕاما دەتگوت دەیەوێ یەکێك لە گوڵەکان لێبکاتەوە. ماوەیەکی زۆر لەوێ مایەوە، لە بیرو خەیاڵ رۆچووبوو، جلەکان دەشەکانەوە لەم مابەینە دا پیاوێك هات و ماچێکی کرد. ئەویش ولاّمی ئەم ماچەی دایەوەو و کەوتنە سەر عەرز و لێك ئالاّن. ماوەیەکی زۆر هەوڵیان دا، هەتا شەکەت و تێر ئاوبوون و، خەویان لێکەوت. کچۆڵەکە سەری سووڕ مابوو. ئەو نەیزانی بۆچی ئەو دووانە لە جیاتی ئەوەی لە بیری لێکردنەوەی گوولی ماگنولیادا بن خەو بردبوونیەوە. بە لە سەرەخۆییەوە چاوڕوانی لە خەو هەڵستانیان بوو کە پیاوێکی تر هات و زۆر تووڕە بوو. قسەی نەدەکرد بەلاّم تووڕەییەکەی دیار بوو، چونکە کەوتە گیانی ئەم دووانە. لە پێش دا دوای پیاوەکە کەوت. پیاوەکە بۆی دەرچوو. پاشان گەڕایەوە سەر ژنەکە؛ ژنەش بە نێو جل و بەرگەکان دا رایکرد پیاوەکە دوای کەوتوو گرتی. وای بەرز کردەوە دەتگوت قوورسایی نیە و لە عەرزی ڕاکێشا؛ کەوتە سەر ماگنولیا. زۆری پێچوو هەتا ژنەکە گەیشتە ماگنولیا و لە کۆتایی دا بە دەنگێکی نادیارتر لە کەوتنە سەر عەرزی گوڵە زەردەکان گەیشتە ماگنولیا. لقێك شکا. لەو کاتەدا لقەکە شکا ژنەکە گوڵێکی لێکردەوە. گوڵەکەی لێکردەوەو جولاّنی نەما، گوڵەکەی بە دەستەوە بوو. کچۆڵە کە بانگی دایکی کرد و گوتی: " دایکە، ژنێکیان خستۆتە سەر ماگنولیاو، ئەویش گوڵێکی لێکردۆتەوە. " دایکی بە پەلە خۆی گەیاندێ، هاواری کرد ژنەکە مردوە. لەو رۆژە بە دواوە کچەکە هاتۆتە سەر ئەو بڕوایە، بۆ لێکردنەوەی گوڵێك، ژنێك دەبێ بمرێ.

ئەو کچە من بووم و، خوا نەکا تۆش وەك من فێر بی کە سەرکەوتوو، ئەوەی براوەیە، هەمووکات بەهێزترین و بێ بەزەییترین دەبێ. خودا بکا ئەوەی وەك من لە تەمەنی لاوی دا فێر نەبێ و لە هەموان گرنگتر ئەوە بزانی کە ژن یەکەمین کەسە کە تاوانی ئەو ڕاستیەی دەداتەوە. بەلاّم بێهودە ئەم ئاواتەت بۆ دەخوازم. ئاواتت بۆ دەخوازم کە زوو سەردەمی منداڵی یان سەردەمی خەون و خەیاڵەکان تێپەر بکەی. دەبێ لە ئێستەوە ئامادەت بکەم بەرگری لە خۆت بکەی و بە هێز تر بی لەوەی فرێت دەنە سەر دار. ئەوە ئەوی تریانە دەبێ لە سەر باڵکۆنەکەوە بکەویتە ژێرەوە. بە تایبەتی ئەگەر ژن بی. ئەمەش یاسایە بەڕێوە دەچێ: لە هیچ شوێنێك نەنووسراوە بەلاّم ئیجبارە. یان ئەمن یان ئەتۆ.

یان خۆم رزگار دەکەم یان تۆ خۆت رزگار دەکەی. ئەمانەی بنەمای ئەم یاسایەن. ئاگادار بە ئەمە لەبیرنەکەی لەم دنیایەدا، هەر کەسەی یەکێك دەچەوسێنێتەوە. ئەگەر وانەکەی تێدا دەچی. گوێ بەم کەسانە مەدە دەڵێن باشترین لە نێو دەچی. ئەوەی لە نێو دەچێ لاوازتر ینە و، ئەوەی بە پێی زەرورەتە باشترین نیە. من قەت نەموتووە ژنان لە پیاوان باشترن، یان شایانی ئەوەن لە بەر رووح سوکیان نەمرن. رووح سووکی یان بەد خووی گوێیان پێ نادرێ: لەم جیهانەدا ژیان پێوەندی بەم شتانەوە نیە. لە جیهاندا جەخت لە سەر هێزەکانی دەمارگرژی دەکرێ. مانەوە دەمار گرژییە. ئەتۆ پێڵاوی چەرمی لە بەر دەکەی چونکە یەکێکی تر مانگای سەر بڕیوە و، کەوڵی کردوە. هەتا پیستەکەی بۆ پێڵاو بەکار بێنێ. ئەتۆ پاڵتۆی پێستی دەبەر دەکەی چونکە کەسێك سەدان حەیوانی کووشتوە هەتا پێستەکەیان بەکاربێنێ. ئەتۆ جگەری مریشك دەخۆی چونکە یەکێك سەری ئەو جووجەڵانەی بریوە کە ئازارێکیان نیە. ئەمەش راست نیە چونکە ئەوانیش ئازاریان بۆ شتی تر هەبووە: کرمیان خواردوە کە بێ ئاگا بەرەو کاهوو چوون بیخۆن. هەر زاڵمەی زەواڵێکی هەیە هەر یەکەی یەکی تری بۆ پەیدا دەبێ بی کوژێ یان پێستی لێبکاتەوە بۆ ئەوەی بۆ خۆی بمێنێتەوە: لە ئادەمیزادەوە بگرە هەتا ماسی. ماسیەکانیش یەکتری دەخۆن. گەورەکان گچکەکان دەخۆن. باڵندەکانیش مێشولەکان. هەتا ئەو جێگەیەی من ئاگام لێیە، تەنیا دارو گیا هیچ شتێك بە ددان هەڵناللووشن: لە ئاوو هەواو خۆر کەڵك وەردەگرن. بەڵام رووەدا ئەوانیش ئاوو هەوا و خۆر لە یەکتری بدزن و، یەکتری بخنکێنن. ئایا بە ڕاستی پێویستە تۆ، تۆ کە بێ کوشتنی هیچ کەسێك دەژی خۆراك دەخۆی و خۆت گەرم دادەپۆشی دەگەڵ کارەساتی ئاوا ئاشنا بی.

*** *** ***

ئەمەش چیرۆکێکی تر. رۆژێك لە رۆژان کیژۆڵەیەکی چکۆلە هەبوو کە حەزی لە شکولات بوو. بەڵام هەتا زورتر حەزی لێ بوو کەمتر دەیخوارد ، دەزانی بۆچی؟ چونکە پێشتر داوای هەرچەندەی کردبوو دابوویانێ. ئەمە لە کاتێك دا بوو لە ماڵێکی دا دەژیا کە ئاسمان لە هەموو پەنجەرەکانیەوە ڕێگەی ژووریی هەبوو، بەڵام ڕۆژێکی لە ماڵێکدا لە خەو هەڵستا بێ ئاسمان و شکۆلات بوو. لە پەنجەرەکانیەوە کە بە بنی میچێکەوە نووسابوون و، وەك زیندان بە میل تەندراون بوون، تەنیا هاتووچۆی لاقەکان دەبینران. سەگەکانیش دەبیندران و، ئەمەش جێگەی شوکر بوو چونکە هەر نەبێ هەمو لەشیان دەبینرا. بەڵام سەگەکان پەلیان هەڵدێنا و بە میلەکانیان هەڵدەمیزت، دایکی کچۆڵەکە بە گریانەوە دەیوت: " ئەی هاوار لێرە نا ! لێرە نا! " جیا لەمانەش دایکی هەمیشە دەگریا. بە زگە گەورەکەیەوە کە لە پێش بەندەکەش هاتبووە دەرێ و لە گەڵ کەسێکی قسەی دەکرد: " ئەتۆ لەمە خەراپتر بۆ هەڵنەدەبژێردرا ! " لێرەدا باوکی کچەکە، کە لە جێگەکەدا کەوتبوو  بە پژمە پژمەوە، کە هەتا سنووری مەرگی دەبرد، وڵامی دەدایەوە. باوکەکە بە روخسارێکی زەردو، چاوانی غەمین هەموو رۆژێ لە تەختەکەدا بە سەر دەبرد. بە حیسابی کچەکە تەواو بوونی شکۆلات هاوکات دەگەڵ نەخۆشی بوونی باوکی و ، کێشانەوەی شتەکان بۆ ئەم ماڵە — بە کورتی، هاوکات دەگەڵ بێ پارەیی — روویدابوو. بۆ ئەوەی بژێویان دابین بکەن دایکی کچەکە کارەکەری خانمۆڵەیەکی جوانی دەکرد، کە هەردووکیان بە " تۆ " یەکتریان بانگ دەکرد. پورێکی دەوڵەمەند بوو دایمە لیباسی دەگۆڕین. تەنانەت دەیگووت بۆ هەر دەستە لیباسێك ساکی تایبەتی هەیە و هەر ساکەش جووتە کەوشێکی تێدایە. ماڵەکەی بە سەر روباردا زاڵ بوو و هەموو ئاسمانی شار لە پەنجەرکانیەوە ڕێگەی ژوورەوەیان هەبوو. بەم حاڵەشەوە خانمە جوانەکە لە ژیانی رازی نەبوو و، هەر بۆڵەو ناڵەی دەهات: دەیناڵاند ئەگەر کلاوێکی لێ نەهاتبا. گازندەو گلەیی هەبوو ئەگەر کارەکەرەکەی ئیزنی یەك مانگەی وەردەگرت و دەچووە لادێ و زۆری پێ دەچوو. بەم جۆرە دایکی کچە چکۆڵەکە بوو بووە جێگری کارەکەرە سەرەڕۆکە: گشت رۆژێ لە کات ژمێر نۆ هەتا یەکی پاش نیوەڕۆ کاری نێو ماڵی بۆ دەکرد. هەرلە بەر ئەم کارە بوو لە

مێردەکەی دوور دەکەوتەوە. کچەکەی دەگەڵ خۆی دەبـردە گەشـت و گـەڕان و دەیگـوت لـەوە باشـترە لـە لای پیاوێـك بـی بۆرییەکانی هەوای کون بووە. بـە پێیـان دەیـبرد. سـەفەرێکی درێـژ لـە کۆڵانـە بـێ کۆتاییـەکان. لـە بـەر خۆیـەوە دەیـوت ئەمجارەیان دەبێ لە گەڵ کامە بەدبەختی خـانمی نـوێ هـاو دەردی بکـا و پـێش لـە دەرگـەدان لـە بـەر خۆیـەوە دەیگـووت "بـە غـیرەت بـە! " لـە ولامـی زەنگـی دەرگـادا دەنگێکـی بـێ حـاڵی گـوێ لێ دەبـوو و، پاشـان هـەنگاوی بـێ تاقـەت تـر لـە دەنگەکەی دەبیست. پاشان دەرگەکە دەکرایەوە و لیبـاس خـەوێکی درێـژی سـپی جـاری واش هـەبوو ئاسمـانی و گۆشـتی وەدیار دەکەوت. کاتێ دەچوونە ژوور بە سەر فەرشـی جۆراوجـۆردا تێپـەڕ دەبـوون. پاشـان دایکـی کچـەکە، کچـەکەی وەك بەستەیەك لە سەر چرپایەك دادەنا و پێـی دەگـوت شـەیتانیان نـەکا و قسـان نـەکاو کـەس ئـازار نـەدا. ئـەو کاتـە دەچـووە ئاشپەزخانە خەریکی شتنی قاپەکان دەبوو. خانمەکەش لە سـەر مـۆبلێکی پـان دەبـۆوە و جگەرەکـەی کـە بـە مۆدنەیـەکی دارەوە بوو دەیکێشا و، خەریکی خوێندنەوەی رۆژنامە دەبوو. بە رواڵەت هیچ کـارێکی نـەبوو. کچـە چـکۆڵەکە نەیـدەزانی بۆچی بۆ خۆی قاپەکان ناشوات و لە دایکی دەوێ بەم زگە گەورەیەوە قاپەکانی بۆ بشوات.

ئـەوڕۆژە ناڵـە نـاڵی خـانمی جـوان لـە سـەر پـارە بـوو. کـاتێ دایکـی کچـەکە قاپـەکانی دەشـت دەسـتی بـە پرتـەو، بۆڵـە کردبوو. کاتێ ژنەکە ژووری میوانی پاك دەکـردەوە درێـژەی بـە گلـەیی و گازنـدەکـەی دا. هـەر دەیگووتـەوە: " کچـەکە تـۆ دەزانی نایەوێت زۆرترم پێ بدا. " کـاتێ دایکـی کچـەکە ولامـی دایـەوە:" ئەگـەر مـن پارەییـەکی وام هـەبا خـۆم لـە جێـی شاهزادەیەك دادەنا." تووره بوو وتی: " ئەمەندە ناکاتە پارە تاکسییەکەشم، ئەتۆ ناکرێ خۆت بێنیە ریـزی مـن! "دایکـی کچە کە سوور هەڵگەڕا و بە بیانووی خاوێن کردنەوەی فەرشەکە هاتە سەر چۆکان و سەری داخسـت. کچـەکە هەسـتی بـە ئازارێك لە گەرووی دا کـرد. دەیویسـت ئـەو فرمێسکانەی چـاوانی دەبرژانـدەوە بسـرێتەوە کـە سـەرنجی بـۆ لای هێنـدێك شتی زێرین کە لە بەر هەتاورا دەدرەوشانەوە راکشا: شیشەیەکی جێ شکولاتی پڕ لە شـکولات. بـەلام شـکۆلاتی ئاسـایی نـا. شکۆلاتی زۆر گەورەتر لەو شکۆلاتانەی لە رۆژانی رابردووی ماڵی پڕ ئاسمـان لـە بـیری بـوو. ئازارەکـەی بـیر چـۆوەو دەمـی پڕ بوو لە ئاو کە تامی شکۆلاتی دەدا. دایکی زانی. چاوە مورەیەکی لێ کـرد هـەتا بزانـێ ئەگـەر داوا شـتێکی بکـا پەشـیمان دەبێتەوە! کچەکە زانی بە ئەدەبەوە سەیری میچی ژوورەکەی دەکـرد. هـەروا سـەیری میچـەکەی دەکـرد خانمـە جوانەکـە هەستاو چووە باڵکۆن و خەریکی لاواندنەوەی مووچی دەستی بوو! لە خوار ئەم باڵکۆنە باڵکۆنێکی گـەورەتری لێ بـوو. لـە سەر ئەو باڵکۆنـە دوو منـداڵی دەوڵەمەنـدی لێبـوون. کچـەکە ئەمـەی دەزانـی چـونکی جارێکیـان بینـی بـوونی و دەیزانـی دەوڵەمەندن چونکە جوان بوون. لەو جۆرە جوانیەی ئاغای دایکی هەیبوو. خانمەکـە خـەریکی لاواندنـەوەی دەسـتی بـوو چاوی بە کچەکان کـەوت. روخسـاری گەشـایەوە و بـزەی هـاتێ. لێیـان چـووە برەوتـر: " سـلاو کـۆترە جوانـەکانم، ئـەمڕۆ چۆنن؟ " پاشان وتی: " بوەستن! شتێکتان بۆ دێنم! " هاتەوە ژووری شوشـەی شـکۆلاتەکانی هـەلگرت. سـەرەکەی لابـرد و بە لە سەرەخۆیی چووە باڵکۆن و شکۆلاتی بۆ خـوارەوە بارانـدن. شـکۆلاتی بـۆ داویشـتن و دەیگـوت: " شـکۆلات بـۆ کـۆترە جوانەکانم. شکۆلات بۆ کۆترە جوانەکانی من! " بەم جۆە زیاتر لە نیوەی شـیرنیەکەی بـۆ هاویشـتن. پاشـان شـکۆلاتەکانی لە سەر جێگەی خـۆی دانانـەوە. شـکۆلاتێکی هـەلگرت و کاغـەزی زێرینـی لێکـردەوەو بـە لـە سـەرەخۆییەوە لـە کاتێـك دا خودا دەیزانی لە بیری چی دایە شکۆلاتەکەی نایە دەمیەوە. خواردی. کچەچکۆڵەکەش سەیری دەکرد.

لەو رۆژەوەیە شکۆلاتم بۆ نـاخورێ. ئەگەر بیخۆم دەیهێنمەوە. هیوادارم تۆ شـکۆلاتت پـێ خـۆش بـێ، چـونکە دەمـەوێ دنیایەکت شکۆلات بۆ بکڕم. دەمەوێ سەر تا پێت لە شکۆلات بگرم. هـەتا لـە جێگـەی مـن، لـە جیـاتی هەسـتی رشـانەوەو، ئەو زوڵمەی کە قەت لە بیرم ناچێ و بۆتە ڕق لە دڵما، شکۆلات بخۆی. تـۆ هـەروەها کـە دەگـەڵ دەمـار گـرژی ئاشـنا دەبـی تامی زوڵمیش دەچێژی: بۆ ئەمەش دەبێ خۆت ئامادە بکەی. باسیی ئەو زووڵمـە ناکـەم بـە مەبەسـتی خـواردنی مریشـك یان سەر بڕینی حەیوانێك بۆ پێستەکەی یـان کوشـتنی ژنێـك لـە مـەڕ تـەنبێ کردنـی دەیکـەن. مەبەسـتم ئـەو زووڵمەیـە

ئەوەی هەیەتی دەگەڵ ئەوەی نیەتی لێك جیا ناكاتەوە. زووڵمێك كە تامی ژار لە دەمدا بە جێ دێڵێ؛ لە ساتێكا دایكی زگ پڕ خەریكی خاوێن كردنەوەی فەرشێكی ترە. نازانم چۆن ئەم كێشەیە چارەسەر بكەم. ئەوانەی هەوڵیان دا ئەم كێشەیە چارەسەر بكەن تەنیا توانیان ئەوەی فەرش دەماڵێ بیگۆڕن. لە هەر نیزامێك دا لە دایك بی، لە سەر هەر ڕێبازێك بێ، هەمیشە كەسێك هەیە فەرشی یەكی تر دەماڵێ، هەمیشە كچێكی چكۆڵە هەیە لە بەر ئەوەی حەزی لە شكۆڵاتە سووكایەتی پێ دەكرێ. قەت ڕێبازو نیزامێك نادۆزیتەوە بتوانێ دڵی ئینسانەكان بگۆڕێ و ڕق لە دڵی لە نێو بەرێ. هەر كەسێكی پێی وتی: " لە لای ئێمە جۆرێكی ترە. " لە وەڵامی دا بڵێ: درۆزن. ئەمجا پێی بڵێ، پێت بسەلمێنێ لە وڵاتی وی دا خواردنی تایبەتی دەوڵەمەندو هەژار لێك جیا نین. زستان وەرزی تایبەت بە دەوڵەمەندە. ئەگەر دەوڵەمەند بی سەرما دەبێتە یاریەك ئەگەر پاڵتۆیەكی پێست بكڕی و خۆت گەرم داپۆشی و بچی بۆ خلیسكە بە ئیسكی. بە پێچەوانەوە ئەگەر هەژار بی. سەرما دەبێتە بەڵاو لە دیمەنی جوانی بەفری سپی بێزار دەبی. بچكۆلە بەرابەری تەنیا لەو جێگەیە هەیە كە تۆی لێی؛ وەك ئازادی. بەڵام ئایا بە ڕاستی پێویستە كە تۆ لە خزمەتی كەس دانی بێی و بەرەو رووی ئەم گشتە بێعەداڵەتیە ببیتەوە؟

*** *** ***

نازانم ئەمە چیرۆكە یان نا، بەڵام هەر چۆنێكی بێ بۆت دەگێرمەوە. رۆژو رۆژگارێكی كچۆڵەیەكی چكۆڵە هەبوو بڕوای بە داهاتوو هەبوو. هەر كەسێكیش دەیگەیشتێ دەرسی بڕوای بە داهاتوو فێر دەكرد و پەند و ئامۆژگاریان دەدایە كە داهاتوو باشترە. كاتێ قەشە پەیامی بارەگای خودای بە مژدە دێنا، هەر ئەمەی پەسند دەكرد. قوتابخانە فێری دەكرد كە بە شەریەت پێش دەكەوێ. لە قوتابخانە پێیان دەگوت بەشەر لە پێشدا لە ئەشكەوتەكان دا ژیاوەو، پاشان نیشتەجێی ماڵی ساردو سڕو بێ كوورە بوون و دواجار دەستیان وە خانوو بە " گەرمی نێوەندی " ڕاگەیشت. ئەوانیش وانەی داهاتوویان بە گوێدا دەخوێند. باوكی نموونەی مێژووی بۆ دێنایەوە هەتا پێی بسەلمێنێ كە ستەمكاران ئاخرەكەی ژێر دەكەون، ئەویش پێرەوی لەم بۆچونە دەكرد. كچەكە هەر زوو بڕوای بە قەشە نەما. ئەو داهاتووەی قەشەكان باسیان دەكرد مەرگ بوو. كچەكەش لەوە كە پاش مەرگی لە میوانخانەیەكی لە رازاوە بە ناوی بارەگای خواوەندی بژی كە نە گەرمای دەبوو نە سەرما بڕوای پێی نەبوو. بڕوای بە بۆچوونی قوتابخانەشی هەر بەم جۆرە لە بیر بردەوە. ئەویش لە زستانا دەست و لاقەكانی سەرمایان بردو بوون بە برین. بەڵێ كارێكی جوان بوو مرۆ لە ئەشكەوتەوە بگاتە ماڵی گەرمی نێوەندی؛ بەڵام ماڵی ئەوان گەرمی نێوەندی نەبوو. تەنیا دڵنیایەكی كوێر كوێرانەی كە باوكی هەیبوو پاراست بووی. باوكی پیاوێكی ئازاو، بوێربوو و، توونر بوو. بیست ساڵ بوو دەگەڵ ستەمكارانی رەش پۆش شۆڕشی دەكرد و، هەر جارەی ئەشكەنجە و ئازاریان دەدا بە دلێری و سەر سەختیەوە دەیگووت: " داهاتوو هەر دێ. " ئەو كاتە كە شەڕ هەبوو. پێدەچوو كە ستەمكارانی رەش پۆش سەر دەكەون. بەڵام ئەو سەری رادەوەشاند بە ئازایەتی و خۆراگرییەوە دەیگوت: " داهاتوو  هەر دێ. "

كچەكە لە مەڕ شەوێك لە شەوەكانی مانگی ژووئیە بڕوای بە قسەكانی باوكی هێنا. ئەو شەوە ستەمكارەكان وە دەرنرابون و پێدەچوو شەڕ تەواو بووبێ و ئاخرەكەی " سبەی " هات؛ بەڵام مانگی سیپتامبر كە هات ستەمكارەكان گەڕانەوە. ئەوان دەگەڵ ستەمكارانی نوێ كەبە ئاڵمانی دەدوان گەڕانەوە.  شەڕەكە توونەتر بوو. كچەكە هەستی كرد خیانەتی پێكراوە. داوای روونكردنەوەی لە باوكی كرد. باوكی وەڵامی دایەوە، " داهاتوو دادێ. " و، كچەكەی بەمە رازی كرد كە داهاتوو ئەوەندە دوور نیە. چونكە تەنیا ئەوان چاوەڕوانی نین؛ هاورێكان لە رێدا بوون ئەرتەشێكی دۆست بە ناوی " هاوپەیمانەكان ". بەیانی ئەو رۆژە شاری كچەكە بە دەستی هێزی "هاوپەیمانەكان" بۆردوومان كرا. تەنانەت بۆمبێك لە بەر ماڵی ئەوان تەقیەوە. كچەكە سەری سوور مابوو. ئەگەر ئەوانە دۆستن بۆ كارێكی وا دەكەن؟ باوكی لە

ولأمدا وتی به داخەوە دەبێ کارێکی وا بکەن ئەمە هیچ لە هاوپەیمانیەتیەکەیان کەم ناکاتەوە و، بۆ سەلماندنی ئەم قسەیە کچەکەی بردە لای دوو کەس لەوانەی بۆمبیان هاویشتبوو و لە زیندانی ستەمکارانەوە رایانکردبوو. باوکی بۆی روون کردەوەو، لە کچەی گەیاند دەبێ یارمەتی ئەمانە بدەن چونکە داهاتوو ئامانجی هاوبەشیانە. کچەکە قەناعەتی کرد. دەگەڵ باوکی کە لە بەر ئەوان مەترسی لە دار دانی خستبووە سەر خۆی حەشاریان دان و خواردنیان پێ دان و بە رێی لادێیەکی ئەمینیان کردن. پاشان کچەکە بە لە سەرەخۆیی چاوەڕێی ئەو ئەرتەشەی دەکرد، دەبوو داهاتوو دەگەڵ خۆیان بێنن. ئەو هێزە هەرنەدەگەیشت. حەوتوو، مانگەکان رابوردن دەگەڵ چاوەروانی دا ئینسانەکان لە ژێر ئەشکەنجەو بە بۆمبی ناپاڵم و گوللە باران کردن دا دەمردن و، ئەو دوارۆژە کە دەبوو بێ تەنیا خەو نەبێ چی تر نەبوو. باوکی کچەکە گیراو کەوتە بەر ئەشکەنجەو ئازار. کچەکە بۆ زیارەتی باوکی چووە زیندان، بەلأم نەیناسیەوە. روخساریان وا لێ کردبوو نەدەناسرایەوە. سەرەڕای ئەمەش لە زیندانیش دا بە کچەکەی دەگوت " داهاتوو دێ، داهاتوویەکی بێ سووکایەتی. " ئەو قسەی دواییی بۆیە کرد، ئەوەندەیان ئەشکەنجە کردبوو روخساری نەدەناسرایەوە. سەرەڕای ئەوەش دەنگێك سرنجی راکێشا. دەنگێك کە دەیگوت " داهاتوو هەر دێ، داهاتوویەك سووکایەتیتێدا نیە. "

ئاخرەکەی داهاتووی وەعدە پێدراو گەیشت. بەیانییەکی رۆژێك لە رۆژەکانی مانگی ئووت بوو. شەوی پێشتر شار بە خەست و خۆڵی بۆمباران کرا. پردەکان رووخابوون شەقام و جادەکان سەرو ژێر بوون و، حەشامەتێکی زۆرو بێ تاوان کوژرابوون. سەرەنجام گازیوەی بەیانی هاواری ناقووسەکانی کلیسا هاوپەیمانانی وەخۆ هێنایەوە. فریشتە یونیفۆرم دەبەرەکان، شادو بە بزەوە بە سەر فەرازی بەرەو پێش دەچوون. خەڵك بۆ بینینیان رایاندەکرد و دەچوونە پێش و گوڵ بارانیان دەکردن. هاواریان دەکرد و سوپاسیان دەکردن. هەمووان سوپاس و رێزیان ئاراستەی باوکی کچەکە دەکرد کە ئازاد بوو بوو. ئەویش روناکی ئیمان لە چاوانی دا دەدرەوشایەوە. پاشان نەفەرێك لێی نزیك بۆوە و پێی وت بە زوویی خۆی بە نێوەندی فەرماندەیی هاوپەیمانان بگەیەنێ، لەوێ روداوێکی ناخۆش روویدابوو. باوکی کچەکە بە راکردن بەرەو ئەوێ چوو لە رێگەدا لە بەر خۆیەوە دەیگوت دەبێ چی روویدابێ. ئەم رووداوە ناخۆشە دیمەنی پیاوێك بوو لە سەر زگ لە سەر چەمەن کەوتبوو نووڕ نووڕ دەگریا. تەمەنی سی ساڵ بوو. لە بەر پێشوازی لە هاورێیان بەرگی شینی دەبەر کردبوو و ، گوڵێکی سووری لە سینگی دابوو : گوڵێکی سووری کاغەزی. لە رووبەرووی ، یان باشترە بڵێین لە سەر سەری ، فرشتەیەکی یونیفۆرم دەبەر، رەشاش بە دەست، لاقەکانی لێك بلأو کردبوو وەستابوو. باوکی کچەکە داهاتەوەو، لە پیاوەکەی پرسی: " چت کردوە؟ " بەم پرسیارە، پیاوەکە لە بانگی گریانی داو تەنیا توانی بڵێ:

"دایە، دایە، دایە. " باوکی کچەکە داوای ئیزنی کرد کە دەگەڵ فەرماندەی هاوپەیمانەکان بدوێ. فەرماندەکە کە روخسارێکی مۆن و گرژ و سمێڵی نارنجی بوون هەر واکە شلاقەکەی رادەوەشاند ئیزنی پێدا بچێتە لای: " ئێوە لەو کەسانەن خۆتان بە نوێنەری میللەت دەزانن؟ " باوکی کچەکە ولأمی بەڵێی دایەوە. "کەواتە پێتان رادەگەیەنم میللەتی ئێوە بە دزی کردن پێشوازییان لە ئێمە کردوە. " باوکی کچەکە پرسی چی دزیوە فەرماندە شلاقەکەی راوەشاند: " کۆڵێکی پڕ لە خواردن و ئەسناد. " باوکی کچە پرسی چ جۆرە ئەسنادێك. فەرماندە شلاقەکەی رادەوەشاند: " دەفتەرچەی خزمەتی خاوەنی کۆلە پشتیەکە. "

باوکی کچە پرسی دەفتەرچەکەی دۆزیوەتەوە.

فەرماندە شلاقەکەی راوەشاندەوەو وتی: " بەڵێ، بەلأم دڕاوە. "

باوکی کچە سەیری دەفتەرچەکەی کردو ویستی پەڕە دراوەکان پێکەوە نوسێنێتەوە. ئەدی خواردنەکەیان دۆزیوەتەوە؟ " خواردنەکەی خواردووە بەشی رۆژێك بوو." شریقەی شلاقەکە هات. باوکی کچە بە پێکەنینەوە ولأمی دایەوە، دیارە ئەم پیاوە کارێکی گەڵێ خراپی کردوە. پێی وت نوێنەری خەڵك دەفتەرچەکەی لێ وەردەگرێتەوە و داوای

لێدەکرێ زیانەکە بژمێرێ. شریقەی شلاقەکە هاتەوە. فەرماندە وتی لە ئەرتەشی ئینگلیزدا دزەکان گوللە باران دەکرێن و نوێنەری خەڵکیش بڕواو لە بەر چاوان ون بێ! دزەکە هەروا دەگریا و دەموچاوی لە نێو شینایییەکە نابوو. " دایکە، دایکە " فریشتەی یۆنیفۆرم دەبەر هەروا لەسەر سەری ڕاوەستابوو. لاقی کورت و تووکن بوون. ڕەشاشەکەی دە گەردنی گرت. کاتێ لەوێ دوور کەوتنەوە کچەکە گوێی لە دەنگە تەقەیەك بوو. دەنگی تووندی زامنی تفەنگ.

کچەکە قەت نەیزانی دزەکەیان سزا دا یان نا، بەڵام لەو رۆژە بە دواوە سەبارەت بە وشەی داهاتوو ڕەش بین بوو. هەروەها چونکە رووحی وشەی داهاتووی دەگەڵ وشەی هاوپەیمانان لێك گرێدابوو لەوانیش بێزار بوو. پاش ئەرتەشی ئینگلیز، ئەرتەشی ئەمریکا هات. گشت لا دەیانگوت ئەرتەشی ئەمریکا یەك ڕەنگ و باشترن لە ئینگلیزیەکان و، کچەکە هیوادار بوو ئەم قسەیە راست بێ، بە تایبەتی کە ئەمریکایییەکان هەمیشە قاقاو پێکەنینیان لە سەر زاران بوو. بەڵام هەر زوو هەستی کرد ئەوانیش بە قاقاکانیان دەیانەوێ زوڵم بکەن و ببنە ئاغا: داهاتوو بوو بە ترسێکی نوێ. لە بری ئەوە برسییەتی هەروا لە جێگەی خۆی بوو. بۆ تێر کردنی زگ ژمارەیەك لە ژنەکان لەش فرۆشیان دەکردو هێندێکیشیان جل و بەرگی ئاغا نوێیەکانیان دەشۆرد. پشت بان و بەر هەیوانەکان پڕ بوون لە یۆنیفۆرم و ژێر شاروال و گۆرەوی شۆراو کە هەڵخرابوون. هەر کەسێکی زۆرتری شۆردبا نانی زۆرتری دەخوارد. شەش جووت گۆرەوی نانێك، سێ بلووز، قووتوویەك گۆشت و قووتوویەك لووبیا؛ یەك دەست یونیفۆرم دوو قووتوو گۆشت. باوکی کچەکە ئیزنی بە کچ و ژنەکەی نەدەدا دەست لەو جل و بەرگە چڵکنانە بدەن. هەر دەیگوت چاك یان خراپ داهاتوو دەستی پێکردەوە و، دەبێ بە سەر بەرزییەوە بەرگری لێ بکەین. بۆ سەلماندنی ئەم قسەیە، هاوپەیمانەکانی بانگ هێشتن کرد، بگرە جیرەی خۆراکی کە وەریگرتبوو دەیدانێ. شەوێکی وتارێکی دوورو درێژی لە بیرەوەری یارمەتیبە هاوپەیمانان کە لە دەستی ستەمکاران رایانکردبوو خوێندەوە. ئەم خووتبەیە بە شانازی ئەو داهاتووە بوو کە هی هەمووان بوو، ساعەتی دەستی زێری پێشکەش بە هاوپەیمانان کرد. هاوپەیمانەکان سەعاتەکەیان لێ وەرگرت و لە بری جل و بەرگی نەشۆراویان پێشکەش کرد! کچەکە دڵگیر بوو. بەڵام برسیەتیی پرە لە دڵە خورپەیی حەیوانی: چەند ڕۆژ دواتر، بە دزی باوکی ویستی جل و بەرگی چڵکن بشوا. دوو کیسەیان پێ دا. کیسەیەك پڕ لە جل و بەرگی چڵکن و کیسەیەك پڕ لە خواردن. سەری کیسەی خواردن بە پەلە کرایەوە: سێ قووتوو لوبیای کولاّو ، دوو نان بەستەیەك بادام و قاپێك بەستەنی . پاشان کیسەی جل و بەرگی چڵکن کرایەوە . کاتێ کچە لە تەشتی کردن لە بەر توورەییان سوور هەڵگەڕا. کیسەکە پڕ بوو لە ژێر شاڵواری چڵکن.

لە کاتی شووشتنی ژێر شاڵواری چڵکن دا بوو هەستی کرد داهاتوو هێشتا نەهاتووە. هەمیشە بە وەعدەو بەڵێنی دەیانخافلاّندن: ریزێك فریوو، سووکایەتی پێ کردن کەبە دڵدانەوە و خۆشەویستی درۆ و پێشکەشی ناقابیل داپۆشرابوون. بچکۆڵە تۆ بڵێی دوارۆژی من بۆ تۆ بگاتە رێ؟ سەدان و هەزاران ساڵ خەڵك بە هیوای دوارۆژ منداڵیان دەبێ و هیوادارن منداڵەکانیان دوارۆژێکی روناکتریان ببێ. ئەو دوارۆژەش ئاخرەکە هەر دەبێتە گەرمی نێوەندی. دیارە کاتێ لە سەرمان هەڵدەلەرزی گەرمی نێوەندی شتێکی باشە. بەڵام بێ شك بەختەوەریت بە دیاری بۆ ناهێنی و پارێزگاری لە کەرامەتت ناکا. بە بوونی گەرمی نێوەندی دەبێ زۆرە مللی و کلاّو لە سەرنانەکان تەحەمول بکەی و داهاتووش وەك درۆیەك لە جێی خۆی دەبێ. پێشتر پێم وتی هیچ شتێك خراپتر نیە لە نەبوون. وتم نابێ لە ئازار بترسی، لە مەرگیش هەروا؛ لە بەر ئەوەی کاتێ کەسێك دەمرێ واتە لە دایك بووە و، پێم وتی رەنجی لە دایك بوون؛ باشترە لە بێدەنگی و نەبوون. بەڵام بچکۆلە ئەمانەی بۆم باس کردی راستن؟ بەڵام ئەمە راستە تۆ بە هۆی بۆمباران یان تەقینی گوللەی سەربازێك کە لە بەر برسییەتی بەشە خواردنەکەت دزیوە بکوژرێی؟ هەتا گەورەتر دەبی من زۆرتر دەترسم. ئەو هیواداری و دڵنیا  بوونە پڕ سەروەریەی کە بە هۆی زانینی راستیەك لە نێو راستیەکاندا هەمبوو

ورده ورده لـه دهسـتم داوه. هـهموو رۆژێ ئهسـیری شـك و دوو دڵییـهكی زۆرتـر دهبم. دوودڵیـهك كـه لـه نێـو رووحمـدا شـهپۆلان دهدا و شـهپۆلهكانی كـهنارهكانی بوونـت تـهڕ دهكـهن و پاشـان پاشهكشـه دهكـهن و كـهف و كـوڵ دهمێنێتـهوه. نامهوێ نائومێدت بكهم، بڕوام پێ بكه، نامهوێ به له دایك نهبوون هانت بدهم! تهنیا دهمهوێ بهرپرسـایهتیهكانم بـه تـۆ نیشان بدهم بتكهمه شهریكی وان. هێشتا ماوهی بیر كردنهوه و پێداچوونهوه به بیرهكانـت مـاوه. منـیش بـه نـۆرهی خـۆم چ شهپۆلهكان بهرز بن و چ كورت ئامـادهگیم ههیـه. بـهڵام تـۆ؟ پێشـتر پرسـم پـێ كـردی ئامـادهی ژنێـك ببینـی بـه سـهر گوڵهكانی ماگنولیادا دهدرێ، ئامادهی بـارانی شـكۆلات بـه سـهر كهسـانێك دا ببـارێ كـه پیویسـتیان پـێ نیـه. ئێسـتا لـه تـۆ دهپرسم ئامادهی ژێـر شـاڵواری چـڵكنی خـهڵكی تـر بشـۆری و بشـزانی داهـاتوو هـهر دوێنێیـه – ئـهتۆ لـه شـوێنێكی هـهر دوێنێیهكت داهاتوویهكه و ههر داهاتوویهكت رۆژێك سهركهوتن. ئهتۆ ئێسـتاش ئاگـاداری خـراپترین راسـتیهكان نـهبووی؛ دنیا دهگۆڕێ بهڵام وهك رابردوو دهمێنێتهوه.

*** *** ***

لـه تهمـهنی ده حهوتوویـدا زۆر زوو گـهوره دهبـی. پـازده رۆژ لهمهوبـهر درێـژیت سـێ سـانتیمیتر نـهدهبووو، كێشـت نهدهگهیشـته چـوار گـرهم. ئێسـتا شـهش سـانتیمیتر دهبـیو كێشـت ههشـت گرهمـه. كـامڵ بـووی. لـه ماسـییه چـكۆلهكهی پێشوو تهنیا شتێك بۆت ماوهتهوه كرداری ههناسـه كێشـان لـه رێگـهی ئاوهوهیـه. ئـاو بـه هـۆی رییـهكانت بـۆ نێـو لهشـهت دهبهیو، بۆ دهرهوهی دهنیریتهوه. كرِكرِهكانت بوون به ئێسقانو ئێسقان بهنـدی جهسـتهت شـكڵی گرتـوه. ددانـهكانت لـه پێشـهوهوه پێكـهوه دهنووسـێنو، دهڵـێن لـهم حاڵهتـهدا، جهسـتهت وهك پـاڵتۆ لـه پێشـهوهڕا بـه قۆپچـه دادهخـرێ هـهتا گـهورهتر ببـی پێسـتت تهنگهبـهرتر دهبـێو، وای لێ دێ ههسـت بـه نارهحـهتی دهكـهی، دهجـوڵێی، دهسـتو چـاوهكانت یهكهمین جولهكانیان دهكهن. ئهژنۆكانت لێرهو لهوێ دهدهی. من چاوهڕوانی ئهمهم. یهكـهمین لێـدانت هیمایهكـه، هیمـای رهزامهندی. له بیرته پێم وتی منیش ئهم كارهم كردو ، له دایكم گهیاند چیتر ئـهم دهرمانـه تاڵهی نهخواتـهوه. ئـهویش دهرمانهكهی رشت. ئهم خولی چاوهڕوانییه دهگهڵ ههڵدانی تۆ پێوهندییهكی پێچهوانهی ههیـه: ههرچـهنده ئـهم خولـه لـه سـهرهخۆتر تێپـهڕێ، چاكتر ههڵـدهدهی. ئهمـه دهمخاتـه بـیری ئهرتهشـی هاوپهیمانـهكان كـه قـهت نهگهیشـتنێ. خـهتای ئهوهیه ناجووڵێم. دوو حهوتووی رهبهقه له سهر جێگه كـهوتووم؛ ئـهم ماوهیـهش كـهم نیـه. ئـهدی ئـهو ژنانـهی حـهوتو ههشت حهوتوو لـه جێگـهدا دهكـهون دهبـێ چیبكهن؟ ژنـن یـان ئـامێری زاوزێ؟ تـهنیا شـتێك كـه سـووكنایم پێدهداهـهر ئهمهیه. ئیدی ئهو ئازاره ناخۆشهی دهتگووت چهقۆم له لاكهلهكهی دهدهن نهماوهو چیتر ههسـت بـه رشـانهوهش ناكـهم. لاقهكانم نیشتونهوهو، ئاوسانیان نهماوه. بهڵام تووشی جۆره نیگهرانیو داماوییـهك بـووم. چـۆن تووشـی بـووم؟ لهوانهیـه هـۆی بێكـاریو بێتاقـهتی بـێ. قـهت نهمـدهزانی بێكـاری چـیهو، بـێ تاقـهتی لـه كـاری نـه دهكـردم. بـهبێ ئۆقرهییـهوه چاوهڕوانی ئـهم دوو رۆژهم كـه ماومـه. ئـهم دوو رۆژه بـه دوو سـاڵ دهبـێ. ئـهم بهیانیـه دهگـهڵت بهشـهڕ هـاتم. دڵـت لـێم هێشاوه. شێت بووبووم. پێم وتـی منـیش مـافم ههیـهو كـهس یـش تهنانـهت تـۆش حـهقت نیـه مـافم وهبهرچـاو نـهگری. بهسهرم دا فیزاندی كه ماندوو بوومو، هێزو توانـام نـهماوه. گوێت لێیـه؟ كاتـێ چـاوهكانت لهسـهر یـهك دادهنێـی ههسـت دهكهم حهز ناكهی گوێ بۆ قسهكانم بگری و، له جۆره بێئاگاییهك دا دهژی. لـه خـهو ههڵسـته، ناتـهوێ ههڵسـتی؟ كهواتـه وهره ئێره وهره لای من. سهر چكۆلهكهت وهسـهر باڵنجه نازهنینهكـه نـێ. بـا لـهلای یـهكتری بنـوین مـن و تـۆ،. . . كهسـی دیكه دهگهڵمان نانوێ.

ئهو هات. پێم وا نهبوو دێ. شهو بـوو. كلیلهكـه لـه كـونی دهرگاكـهدا سـووڕا پـێم وابـوو هاوڕێیهكهمـه. هـهموو شـهوێ پێش نان خـواردن دێتـه لام. سـڵاوم لێ كـرد دڵنیـا بـووم بـه ههناسـهبڕكێو بهسـتهیهك بـه دهسـتیهوه وه ژوور دهكـهوێو دهڵـێ بم بـووره ـ بهپهلـهم ـ هێنـدێك گۆشـت. سـارد ـ میـوه ـ بـۆم هێناوێـ بـهیانی ـ دهتبینـم. بـهڵام ئـهو بـوو. لهسـهر

پەنجەی پێ دەهات. وەرسووڕامەوە لەوێ بوو، دەمو چاوی تێك نـابووو، دەسـتە گوڵێکی بـە دەسـتەوە بـوو. لـەپێش دا وام زانی کەسێك قەمپاڵی لە زگم گرت ئازارەکەی وەك ئازارەکانی پێشوو نەدەچوو. دەتگوت لێـی ترسـاوی، مسـتو پێلاقـەت لێ دەدام بۆ ئەوی لە پشت دڵو ریخۆڵەکانم حەشارت دەم. هەناسەم گیراو بایەکی سارد بە لەشم دا هـات. ئـەتۆش هەسـتت پێکرد؟ ئەتۆش ئازارت پێ گەیشت؟ بە بێ دەنگی بە دەمو چاوێکی مۆنەوە دەسـتە گوڵەکـەی بـە دەسـتەوە بـوو لـە جێـی خۆی راوەستا. بێزم لە قەلافـەتو گوڵـەکانی بـۆوە. بۆچـی وەك دزەکـان هـاتبووە سـەر سـەرم راوەسـتابوو؟ بـۆ نەیـدەزانی نابێ ژنی زگ پڕ بترسێنی؟

پرسیم: "چیت دەوێ؟" بـە سـوکی گوڵـەکانی لەسـەر تەختەکـە دانـا. بـێ دواکـەوتن وتم گوڵ دانـان لـە سـەر تـەخت شـوومی بـاش نیـەو گـوڵی لـە سـەر قـەبری مـردوان دادەنـێن. رەنگـی گوڵـەکان زەرد بـوون. دڵنیـا بـووم پـێش لـە هـاتنی کرێیبـوونیو بـە بـێ هـیچ هەسـتو بیرلێکردنەوەیـەك هێنـابوونی. بـەبێدەنگی وەسـتا بـوو. سـێبەرە رەشو بەرزەکـەی کەوتبووە سەر دیواری سپی. بـەلام سـەیری نـەدەکردم؟ سـەیری وێنـەی سـەر دیوارەکـەی دەکـرد. ئـەو وێنەیـەی تـۆی لـە تەمەنی دوو مانگیدا پیشان دەدا، دیارە چل کەرەت گەورەتر. دەتگوت ناتوانێ چاو لەسەر چاوانت هـەلگرێ. هـەتا زۆرتـر سەیری دەکردی سەری زۆرتـر دەچووە نێو شانەکانی. ئاخرەکەی سەری خستە سەر دەستەکانیو دەسـتی کـرد بـە گریـان. لـە پێشـدا گریانەکـە سـەبرو بـێدەنگ بـوو، بـەلام پاشـان لـە بـانگی گریـانی دا. لـە تەنیشـت تەختەکـە چـۆکی دادان. تەختەکـەی دەجوولانـد. پـێم وابـوو ئـەو جوولانـە ئـازارت دەدا. پـێم گـوت: "تەختەکـەی دەجـوولێنی، منداڵەکـە ئـازاری پێدەگات." سەری هەڵبڕیو چاوانی بە دەسرە سڕی. پاشان لە سەرچرپایەکە دانیشت. ئـەو چـرپایەی لـە ژێـر وێنەکەتـە. لەوە کە تۆی لە تەنیشت خۆی دەدی سەری سوور مابوو. ئەتۆ بە مژۆڵی بێ جووڵـەو ئـەویش بـە رەشـکێنەی چاوانی کـە هەڵدەلەرزینو رەزامەندیان پێوە دیار نەبوو. پاشان زمانی کرایەوە. "منداڵەکە هی منیشە."

لە تووڕەییان هەڵدەلەرزیم. بڕێك راست بوومەوە. بە سەرم دا قیژاند کە، ئـەتۆ نـە هـی منـی نـە هـی ئـەو: ئـەتۆ هـی خۆتی. بە سەریدا رووخامو پێم وت واز لەو گاڵتەجارییـەی بێنـێ بـەناوی ئـەوین لـە فیلمەکانـدا پیشـان دەدرێ. پـێم وت من لەمانە بێزارم، دوکتور پێی وتووم ئارام بمو لە ئیسراحەت دا بم.

نازانم بۆ هاتبووە لام؟ بۆ ئـەوەی تـۆ بـێ کێشـە لـە نێـو بـەرێو پـارەی لـە باربردنەکـە بـدا؟ چـەند جـار گوڵـەکانم لـە مێزەکەدا. ئەوەنـدەم لـە مێزەکـە راکێشـان هـەتا پـەڕەکانیان پـرشو بـلاو بـوون. کاتـێ سـەرم کەوتـەوە سـەر سـەرینەکە، بەرگەکانی خەوی بەرم شەتاڵی ئارەقـە بووبـوونو پێمـەوە نووسـابوون. ئـازارو ژانـی زگـم ئەوەنـدە زۆر بـوو خـۆم پـێ ڕا نەدەگیرا. بەلام باوکت لە جێگەی خـۆی نـەجوولا. تـەنیا سـەری داخسـتو لـە بنـەوە ورتـە ورتێکـی لێ هـات: "چـەندە دڵ رەقی! بۆ ئاوا خراپی!" پاشان خووتبەیەکی دوورو درێژی دەست پێکرد. کەمن بە هەڵەدا چـووم. تـۆ هـی هـەردووکمانی، ئەویش ئەم ماوەیە زۆر لە بیرت دا بووەو، تووشی رەنجو ئازار بووە. بریاری منی لە بەر پاراسـتنی تـۆ بـە کارێـك ژیرانـە دانـاوە، منـداڵ نابـێ فـرێ بـدرێ، لـە بـەر ئـەوەی منداڵـە، منداڵـەو زبـڵ نیـەو، لـەم شـتە قۆڕانـە. قسـەم پـێ بـڕی. بـە تووڕەیییەوە پێم وت: "منداڵەکە خۆ لە دڵی تۆدا نیە، ئەتۆ ناچار نی نۆ مانگی تەواو لە زگی خۆت دا هەڵیگری!"

دەمی کرایەوەو بە سەر سووڕماویەوە وتی: "پێم وابوو منداڵەکەت گەرەکەو بە لە دایك بوونی گەلێ شاد دەبی."

لـەو دەمـەی دا شـتێك روویـدا کـە هۆیەکـەی نـازانم: "لـە خـۆڕا دەسـتم کـرد بـە گریـان. دەزانـی هـەتا ئـەو کاتـەی نەگریابوومو، نەمدەویست بگریم. چونکە گریان بێنرخو ناشیرینی دەکـردم. بـەلام هەرچـەندە هـەوڵم دەدا فرمێسـك لـە چاوانم نەیەنە خوار خێراتر هەڵدەڕژان. ویسـتم جگەرەیەك پـێ بکـەم فرمێسکەکانم نەیانهێشـت. باوکـت هەڵسـتاو هاتـە لام. دەستی بە سەرم دا هێناو لاواندمیەوە. پاشـان بـە ئەسـپایی وتـی: "قـاوەت بـۆ دروسـت بکـەم."و چـووە ئاشـپەزخانە. کاتێ گەڕایـەوە بەسـەر خۆمـدا زاڵ بووبوومـەوە. فینجـانی قاوەکـەی وەك ئـەوەی زێـڕی بەدەسـتەوە بـێ هێنـای. قاوەکـەم

خورادەوە. پاشان چاوەڕێی بووم بڕوا؛ بەڵام نەڕۆیشت. لێی پرسیم چیم پێ خۆشە بیخۆم. وەبیرم هاتەوە هاوڕێکەم بە پێچەوانەی هەموو شەوێك ئەمشۆ نەهاتۆتە سەردانم – هەستم کرد هاوڕێیەکەم باوکتی ناردوە ـ رقم لێ هەڵستا. بە گەشتی رقم لە هەموو ئەو کەسانەیە پێیان وایە بە یاسا چاپ کراوە راستو چەوتەکانیان یارمەتی خەڵکی دەدەن. مریەم، عیسا، یۆسف. بۆ چی یۆسف؟ مریەم زۆر باش بوو بە خۆیو منداڵەکەیەوە. تەنیا شتێکی لە دروستکردنی چیرۆکی ئەو پیاوە دا قبووڵ دەکرێ: "ئەفسانەیەکی بەشکۆی تۆوێك بوو، بێ یەك گرتن دەگەڵ تۆوێکی تر. ئەگەر وایە ئەدی یۆسف چی دەکرد. تایبەت مەندی چی بوو؟ راکێشانی وڵاغێك کە نەیدەویست بڕوا؟ بڕینی پەتی نێوكو دڵنیا بوون لە هاتنە خواری ئاوەڵ منداڵ؟ یان پاراستنی ئابڕووی ژنێکی بێ مێرد کە زگی پڕ بووبوو؟ باوکت لە سەر عەردی پان بوو بۆوەو، گوڵە هەڵوەریوەکانی کۆ دەکردنەوە. تۆزقاڵێك خۆشەویستیو دڵسۆزیم بەرامبەری لە خۆم دا هەست پێ نەدەکرد. بە هاتنە ژوورەوەی ئەو هاوسەنگییەی لە نێوانمان دا پێك هاتبوو تێك چوو. لە نێوان منو تۆدا واتا دروست بووبوو. تێدەگەی دەڵێم چی؟ غەریبەیەك هاتبوە نێو ژیانی تایبەتی منو تۆوە. وەك مووبلێك پێویستیت پێ نیەو، بەڵام بوونی جێگە داگیر دەکاو لە سووچێکی هەڵدەنگوێو دەتخاتە سەر عەرز. لەوانەیە ئەگەر هەر لە سەرەتاوە دەگەڵمان با بوونی شتێکی ئاساییو تەنانەت پێویستیش با. بەڵام ئێستا وە کەسێك دەچی سەر بەر دەداتەوەو دەچێتە رێستورانو بێ ئەوەی لێیان گێڕابێتەوە دەێتە سەر مێزی کەسێکیتر دادەنیشێ. زۆر ناخۆشە. پێم خۆش بوو پێی بڵێم: " تکات لێدەکەم هەستە بڕۆ. ئێمە پێویستمان بە تۆ نیە. نە بە تۆ، نە بە یۆسف. نە بە خودا. باوکمان ناوێ، مێردمان ناوێ، ئەتۆ زیادی!" بەڵام نەمدەتوانی. وەك ئەو کەسەی کە ناتوانێ ئەوەی بێپرس هاتۆتە سەر مێزەکەی دەنگ بدا. لەوانەیە ئەمە لە بەر ئەوە بووبێ هەستی بەزەییم بەرامبەری بووبێ. هەستێك کە وردە وردە دەبوو بە لێك تێگەیشتن. سەرەڕای هەموو خراپیەکان ئەویش ئازاری بەم رووداوە دەکێشا. خودا دەزانێ هاتنی بۆ ئێرە بەم دەستە گوڵە زەردە ناشیرینەوە چەندە بۆی بە گران تەواو بووە: لەوانەیە ماوەیەکی زۆر لەگەڵ خۆی لە کیشەدا بووبێ بێت یان نەیەت هەتا خۆی قانیع کردوە بێتە ئێرە. کەس بێ نوتفە لە دایك نابێ. دڵۆپە رووناکییەك کە رێگای هێلکەدانی دۆزیبۆوە هی ئەو نەبوو. نیوەی بوونت هی ئەو بوو. ئەوەی لە بیرم کردوە پێت بڵێم ئەوەیە ئەو نرخە بۆ تەنیا یاسایەك کە کەس پەسندی نەدەکرد دابوومان: ژن و پیاوێك یەکتری دەناسن، یەکتریان بە دڵ دەبێ، یەکتریان دەوێ، ئاشقی یەکتری دەبن و، پاش ماوەیەك یەکتریان خۆش ناوێ. ئیدی یەکتریان گەرەك نیە و، خۆزگە دەخوازن دەگەڵ یەکتر ئاشنا نەبایەن. ئەوەی بە دوایا دەگەرام دۆزیبوومەوە، منداڵ: لە نێوان پیاو و ژنێك دا.ئەوەی ناوی نراوە ئەوین، وەك بەهار و پاییزە. کاتێ ئەوین دەردەکەوێ وەك بەهارە کە بە گوڵ و گوڵزار دەست پێ دەکا، کاتێ تەواو دەبێ وەك پاییزە کە جیا لە پووشو پەڵاشو گەڵای زەرد چیتر بە جێ ناهێڵێ.

ئیزنم پێ دا نانی شەوم بۆ ئامادە بکا. ئیزنم پێ دا شوشەی شامپاینەکە لە گەڵ خۆی هێنابووی سەرەکەی بکاتەوە (کاتی هاتنە ژوور شوشەکەی لە کوێ شاردبۆوە؟) هێشتم ئاو بە خۆی دا بکا. لە حەمام دا فیکەی لێدەداو گۆرانی دەوت، دەتوت هەموو شتێکی نێوانمان کۆتایی هاتوە. ئیزنم پێدا لێرە لە جێگەکەم دا بخەوێ. بەڵام ئەمرۆ بەیانی، کاتێ رۆیشت، شەرمم کرد. هەستم کرد بریارەکەم شکاندوە و خیانەتم پێ کردوی. خۆزگە قەت نەدەهاتەوە ئێرە.

★★★ ★★★ ★★★

پیاسە لە شەقام پاش ئەم هەموو مانەوە لە جێگەدا! شنەی با کە لە سەرو چاوی دەدام دەگەڵ تیشکی خۆر کە لە چاوانم چەقیبوو! هاتو چۆی خەڵك ئەوەندە ژیانیان لا گرینگ بوو! ئەگەر عیادەی دوکتور دوور نەبا بە پێیان دەچووم و لە رێگەدا لە بەر خۆمەوە گۆرانیم دەوتن. بە بێ مەیلی بانگی تاکسیم کرد. لێخوری تاکسی‌یەکە شعووری نەبوو، جگەرە بۆن ناخۆشەکەی بە لای لێویەوە بوو فرێی بدا. دڵم لە ژێلا دەهات و خەریك بوو تێك دەچووم.

ئەوەندەش خراپ لێی دەخوری هەموو جارێ کە ستۆپی دەکرد بە پێشەوەی دادەدام. هەرکە تاکسییەکە بە رێ کەوت توشی دلهێشە و ئازار بووم و، شادی و خۆشی چەند سات لەمەو بەر بوو بەو حالەتی تووڕەیی جاران کە گەیشتمە عیادەی دوکتور توشی دە پازدە ژنی زگ پڕ بووم کاتێ بەر دەستی دوکتور داوای لێ کردم چاوەروان بم ئەوەندەی تریش تورە بووم. حەزم نەدەکرد دەگەڵ ئەو ژنە زگ هەڵمساوانە لە هۆدەیەك دا دانیشم: لایەنی لێك چونمان نەبوو. بگرە زگیشم چوکەتر بوو. هەر دیار نەبوو کە زگم هەیە. ئاخرەکەی چومە ژوری دوکتور. جل و بەرگەکانم دانا و لە سەر تەختی معاینە راکشام. دوکتور بە سەری پەنجە بە دوات دا دەگەرا و عەزابی دەدام. ئاخرەکەی دەستەوانە لاستیکیەکەی دانا و، بە دەنگێکی کز وتی: ((بە راستی ئەم منداڵەت گەرەکە؟)) بروام نەدەکرد. لە وڵام دا وتم: ((بەڵێ، بۆ چی؟))

((چونکە زۆربەتان دەڵێن کاتێ پێیان خۆش بووە منداڵیان ببێ عاقڵیان نەبووە. بەڵام ئیستا راستیەکەی ئەوەی نایانەوێت. هەر بۆیە بە بێ دوو دڵی هەر چی لە دەستیان بێ دەیکەن بۆوەی منداڵەکەیان لە دایك نەبێ.)) رەنجام. بۆ قسە کردن لە دەگەڵ دوکتوری دەرونی نەهاتوومە ئێرە بەڵکوو هاتوومە ئێرە بزانم تەندروستی منداڵەکەم چۆنە. شێوەی قسە کردنی گۆرا و، بە ئەدەبەوە وتی هێندێك کەم و کوریی هەیە بەڵام بە چاکی نازانێ ئەم کەم و کۆریانە چین. وتی سلامەتی کۆرپەکە زۆر باشە و لە جێگەی سروشتی خۆیەتی. بە بڕوای وی گەشەی کۆرپەڵەکە لەو پەڕی سروشتی بوونی خۆی دایە. بەڵام وا دیار بوو شتێك هەیە. منداڵدانم باش نەبوو، زۆر حەساس بوو. دوکتور وتی بۆم دانابووی نەجوڵێی ئەمەت وەبەر چاو گرتوە، وتم بەڵێ. وتی هەر وەك بۆم دانابووی جگەرە و ئالکۆلت بە کار نەهێناوە، وتم بە کارم نەهێناوە. وتی کاری قورست نەکردوە. وتم نا. وتی نزیکایەتی کەست نەکردوە. وتم بەو زوانە نا. هەر واش بوو.

ئەتۆ دەزانی: ئەو شەوەی سەرەڕای ئەوەی باوکت زۆری داوا کرد ئیزنم پێ نەدا لێم نزیك ببێتەوە. دوکتور کەوتە شکەوە وتی: ((نیگەرانی هیچ هەی؟)) وتم بەڵێ، وتی: ((دڵ رەنجانت هەبووە؟)) وتم بەڵێ. بەڵام لێی نەپرسیم چ شتێك ئازارم دەدا و نیگەرانی چیم؟ پاشان ڕای خۆی پێ وتم. ئالۆزی و نیگەرانی ئازاری دەروونی کە تووشی ژنی زگ پر دەبێ زیاتر لە ماندوو بوونی جەستە زیان بە ژنەکە دەگەیەنێ و هێلکە دان تووشی وێك هاتنەوەیەکی زۆر دەکا، بەم جۆرە ژیانی کۆرپەڵەکە دەکەوێتە مەترسیەوە. لە بیرمان نەچێ منداڵدان پێوەندی بە رژێنی هایۆفیزەوە هەیە و هەر شتێك ببێتە هۆی هاندانی رژاندنی کار دەکاتە سەر ئامێری زاوزێ. زۆر تووره بوون، کێشەیەکی دەروونی، رووداوێکی چاوەروان نەکراو دەبنە هۆی ئەوە کۆرپەڵە لە دیواری منداڵدان جیا بێتەوە و بیکوژێ. لەمە بەدواوە دەبێ بەرگری لە ئالۆزی و بیر کردنەوەی بێ جێ بکەین. ئارامی، بێدەنگی و، لە سەرە خۆیی تەنیا نووسخەیەك بوو بۆی نووسیم. پێم وت: ((دوکتور رێنوێنیەکەت وەك ئەوە وایە لەمنت گەرەك بێ رەنگی چاوانم بگۆرم. سروشتم ئیزنم پێ نادا لە سەر خۆ بم.))

بە ساردی و بێ دەروەستیەوە وڵامی دامەوە: ((ئەمە پەیوەندی بە خۆتەوە هەیە هەوڵ بدە هێندێك قەڵەو ببیەوە.)) پاشان هێندێك دەرمانی وێك هاتنەوەی ماسوولکەی بۆ نووسیم و پێی وتم ئەگەر پەڵە خوێنێکم دی زوو بێمەوە لای.

دەترسم. لێت توورەم. پێت وایە من چیم؟ قووتووم؟ سندووقم؟ خودایە گیان من ژنم، مرۆڤم. ناتونم پێچ و مۆرەکانی مێشکم شل و توند بکەم و، پێش بە بیر کردنەوەیان بگرم. ناتوانم خەتی سوور بە سەر هەستم دابێنم و دژی بشێوییەکانی ڕاوەستمەوە. ناتوانم لە بەرامبەر تووڕەیی و شادی و ئازار دا بێ هەڵوێست بم. لە بەرامبەر زۆر شت دا دژ کردەوە نیشان دەدەم. سەرم سوور دەمێنێ، نارەحەت دەبم. تەنانەت ئەگەر بش توانم ئەم گۆران کاریانە لە خۆما

پێك بێنم ئەم کارە ناکەم. نامەوێ و ببمە ماشێنی ئینسان دروست کردن! بچکۆلە! تۆ چەندە پڕ ئیدیعای. یەکەم جار جەستت داگیر کردم و، سەرەکیترین ماف واتە جوڵانت لێ ستاندم. ئێستاش دەتەوێ دڵ و روحم و لێ زەوت بکەی. ئەوانت لاواز و بێ کەلك کردون. توانایی بیر کردنەوە و هەستی ژیانم لێ دەستێنی! بگرە نەستیشم تاوانبار دەکەی. خەریکە پێ لە بەرەت زیاتر ڕا دەکێشی. ئەمە ئینساف نیە. بچکۆڵە، ئەگەر خوازیاری ئەوەی پێکەوە بین دەبێ هێندێك مەرج وەبەر چاو بگری. سەیرکە من شتێکت بۆ وەبەرچاو دەگرم جەستەم دەخەمە بەر دەستت و خۆم قەلەو دەکەمەوە. بەڵام روح و دەرونم داگیر مەکە. هەر وەها ناتوانم دژکردەوە نیشان نەدەم. ئەوانە هی خۆمن. ئەتۆ نابێ کارت بەمانە بێ. ئێستا هەر چەندێکی پێم خۆش بێ ویسکی دەخۆمەوە رۆژێ یەك پاکەت جگەرە دەکێشم بەم جۆرە درێژە بە بوونم دەدەم وەك مرۆڤێك نەك وەك سندوقێك. کەی پێم خۆش بێ دەگریم. ئەوەندە دەگریم. لێت ناپرسم بزانم ئەو کارانە تووشی ئازارت دەکەن یان نا. چونکە لێت ماندوو بووم.

★★★ ★★★ ★★★

بم بوورە. لە وانەیە سەرخۆش بووبم یان لە سەری دا بووم. ئەم قونچکە جگەرانە سەیربکە. ئەم دەستە سڕە سەیر بکە ئێستاش هەر تەڕە. هەڵچونێکی کەرانە و دیمەنی بێزراو! لە خۆبایی بوو بووم! بچکۆلە تەندروستیت چۆنە؟ هیوادارم لە من باشتر بی. بێ سەبر بووم. ئەوەندە ماندوو و، بێزارم بریا هەتا شەش مانگیتر خۆم راگرتبا هەتا لە دایك دەبووی، پاشان بمرم. ئەتۆ جێگەی من دەگریەوە و، منیش ئاسودە دەبم. پێم وانیە بۆ مردن ئەوەندەش زوو بێ. پێم وایە ئەوەی هەتا ئێستا دەبوو بیبینم بینیومەوە و، ئەوەی دەبوو هەتا ئێستا لێی تێبگەم، لێی تێگەیشتوم. هەر چۆنێکی بێ کاتێ لە زگی من هاتیە دەر پێویستت بە من نیە. هەر ژنێکی خۆشتی گەرەك بێ، دەتوانێ دایکێکی باش بێ بۆت.

باسی هاو خوێنی درۆیەکە هیچ شتێك نایپالێوێ. دایك ئەو کەسە نیە کە لە زگی دا گەورەت دەکا. دایك ژن یا پیاوێکە کە پەروەردەت دەکا. دەتوانم بە دیاری بت دەم بە باوکت. هاتەوە سەردانم و گوڵێکی شینی بۆ هێنام. دەڵێن شین رەمزی کورە. ئێستا ئەو بیر لە رەنگیش دەکاتەوە. پێی خۆشە ئەتۆ کور بی: کور بوون، لە روانگەی ئەوەوە ئیمتیازێکە. جۆرە زاڵ بوونێکە. داماوە خەتای ئەو نیە. ئاوایان بە گوێدا خوێندوە، خودا پیرە پیاوێکی ریش سپییە و، مریەمی پیرۆز تەنیا منداڵ دانێکی بێ کەلك بوو و، بێ یوسف توانای نەبوو کەلاوەیەکی بدۆزێتەوە کە پرۆمتە ئاگری تێدا بکاتەوە. نامەوێ سوکایەتی بە باوکت بکەم. بەڵام دەمەوێ بڵێم من، ئێمە پێویستیمان بەو نیە. گوڵە شینەکەشمان گەرەك نیە.

پێم وت لە ماڵەکەمان وەدەر بکەوێ و لێ گەرێ بە ئاسوودەیی بژین. دەتگوت کوتکیان لە سەری دابوو بە لاترە لاتر بەرەو دەرگا چوو بێ ئەوەی وڵام بداتەوە وەدەر کەوت. ماوەیەکی تر من و تۆش دەچینە دەر دەچینە سەر کار. بەرێوبەرەکەم پێی راگەیاندوم هەست بەم وەزعەی من دەکا، بەڵام منیش دەبێ رێز بۆ لێپرسراوەتیەکانم دانێم. ژنی زگ پڕ تەنیا لە مانگەکانی کۆتایی دا رێگەی پێ دەدرێ کارەکەی جێبێڵێ. ئاماژەی بە سەفەرە گرینگەکەشی کرد. بە ئاشکرا هەڕەشەی لێ کردم کارەکەی بە پیاوێك دەسپێرێ. چونکە هەر نەبێ لەوە دلنیا دەبێ پیاوان تووشی هێندیك شت نابن. حەزم دەکرد لە حەرزی راکێشم. بەڵام بە زەحمەت خۆم پێ راگیرا. دە رۆژێکی ناخۆشمان لە پێشە و، دەبێ کاتی لە دەست چوو قەرەبوو بکەینەوە. بەڵام دەبێ شتێکت پێ بڵێم ئەوە کە بەم زوانە دەست بە کار کردن دەکەمەوە. لەم پەشێوی و، سەر هێشەیە رزگارم دەکا کە ببووە هۆی ئەوە بیر لە مەرگ بکەمەوە. بە خۆشیەوە لەمە بەدوا زستانە. زگم گەورە بووە و لە ژێر پاڵتۆ کەمتر دیارە. زگم لەمەش گەورەتر دەبێ. ئەمرۆ بەیانی هەست دەکەم زگم گەورەتر

بووه. کراسەکە بە بەرم تەسك تر بۆتەوە. لە تەمەنی چواردە حەوتوییدا چەند سانتی میتر دەبی؟ نزیکەی دە سانتی ئاوەڵ مندالیش لە هەموو لایەکەوە فشار دێنیٚ. ئەتۆ بیٚ ڕەحمانە هەموو شتێکت داگیر کردوم.

★★★ ★★★ ★★★

من لەو مرۆڤانە نیم بینینی خوێن بمترسێنیٚ. ژن بوون بۆ خۆی فوتابخانەیەکە بۆ ئاشنا بوون دەگەڵ خوێن. ئێمە هەموو مانگی جاریك دیمەنی ناشیرنی خوێن دەبینین. بەڵام کاتیٚ ئەو پەڵە خوێنە چووکەم لە سەر مەلافەکە بینی، بەر چاوانم لێل بوون و، ئەژنۆم نوشتانەوە. لە سەرەتا دا خۆف پاشان بیٚ ئومێدی سەر تا پێی لەشی داگرتم و، بێزم لە خۆم کردەوە. خۆم لە بەرامبەر تۆدا، کە توانای بەرگری کردنت لە خۆ نیە، بە گەڵیٚ شت تاوانبار کرد. ئەتۆ بیٚ دیفاعی و کەوتویە بەر گاڵتەو گویٚ پیٚنەدانە جۆراوجۆرەکانم. پەڵە خوێنەکە تەنانەت سوورێکی تێر نەبوو. پەڵە خوێنەکە ئاڵ بوو. هەر چۆنێکی بیٚ ئەو تکە خوێنە بەس بوو پەیامی تۆم پیٚ بگەیەنیٚ و، پێم بڵیٚ ئەم هێمایە لەوانەیە کۆتایی تەمەنی من بیٚ. مەلافەکەم کۆ کردەوە و رامکرد. دوکتورەکە بە پێچەوانەی ئەوەی من چاوەروان بووم دەگەڵم سەرو روو خۆش بوو. پێشوازی لیٚ کردم و، وتی ئەهوەن بم: ئەتۆ هەڵنەکەنرابووی، ترسی مەرگیشت لە سەر نەبوو تەنیا برێك ئازارت پیٚ گەیشتبوو پشوو دانێکی تەواو دەیبردیەوە دۆخی جاران، دیارە ئەگەر من ئەوە وەبەر چاو بگرم کە نەجوولێم و تەنانەت بۆ دەست بە ئاویش لە جێگە نەیەمە دەریٚ. بۆ بەرێوە بردنی پشووێکی وا ترسناك پیویست بوو بێینە نەخۆشخانە. ئێستا من و تۆ لە نەخۆشخانەین. لە ماتەمخانەیەك لەم دنیا پڕ غەمە دا حەوتوویەکە کار و پیشەم خەوتنە. حەبی ئازار وڕ و کاسیان کردوم. ئیستا حەبی ئازارم نادەنیٚ. بەڵام حاڵم خەراپتر بووە: نازانم ئەم ماوە بێمانایەی بۆیان داناوم بحەسێمەوە چۆن بەسەر بەرم. داوای رۆژنامەم کرد بۆیان هێنام. داوای تەلەفزیۆنم کرد بۆیان نەهێنام. داوای تەلەفۆنم کرد وتیان باش نیە. نە هاورێیەکم دیارە نە باوکیشت. ئەم بیٚ دەنگیە هەناسەم لیٚ دەبریٚ. یەخسیری حەیوانێکی سپی پۆش بووم کە ماوە ماوە دەرزی پێیەو بە توورەییەوە دیٚ و بەدەنمی کون کون کردوە. وەك جاران ناتوانم خۆشەویستیت پیٚ بکەم. ئەو بیرانەی ماوەیەکی زۆر دەمخواردنەوە و پێش ئەوەی هێزیان بێتە بەر دەمخنکاندن ئێستا هەموویان بە جارێکی رژاونە هەستم و هێرشیان بۆ هێناوم و، شتی سەیر سەیر دەڵێن: بۆ چی دەبیٚ دەردوو ئازارێکیوا تەحەموول بکەم؟ لەبەر ساتێك خۆشی دەگەڵ پیاوێك؟ لە بەر ئەو خانەیەی دابەش بە دوو و چوار و هەشت و بیٚ کۆتایی خانەیتر دەبیٚ؟ بیٚ ئەوەی ئەمن حەزم کردبیٚ، یان فەرمانی من بووبیٚ؟ یان لەبەر ژیان؟ باشە با وا دابنێین لە بەر ژیانە. بەڵام ئەمە چ ژیانێکی بیٚ یاسایە کە لەبەر تۆ کە هێشتا نەبووی لە من کە هەنوکە هەم نرخێکەی زیاتر دادەنیٚ. ئەمە چ جۆرە رێزلێنانێکە لە تۆ کە رێز بۆ من دانانیٚ. ئەم مافی بوونەت چۆن شتێکە مافی من داگیر دەکا؟ تۆزقالێك ئینسانیەتت لیٚ بە دی ناکریٚ. ئینسانیەت! بەڵام داخوا تۆ بونەوەرێکی ئینسانی. بە راستی تۆوێك و ئیسپرماتۆزوییدێکی پێنج مایکرۆیی دەتوانن ئینسانێك دروست بکەن؟ ئینسان منم بیر دەکەمەوە، قسە دەکەم، پێدەکەنم و دەگریم، کردەوەکانم بەرهەمیان هەیە. ئەتۆ تەنیا بووکە شوشەیەکی لە گۆشت دروست کراوی بووکەڵەیەك بیر ناکاتەوە، قسان ناکا، پیٚناکەنیٚ و ناگریٚ و کاریشی تەنیا دروست کردنی خۆیەتی. ئەوەی لە تۆ دا بە دی دەکەم ئەتۆ نی: بۆ خۆمم!

ویژدانێکم پیٚ داوی کە تۆ نیتە. قسەم دەگەڵ کردی. بەڵام ویژدانی تۆ ویژدانی منە و قسەکانی نێوانمان لە ڕاستی دا قسەی یەك کەسە. قسەی من! ئەم کۆمێدیە و ئەم ورێنانە ئیتر با بەس بیٚ! پێش لە دایك نەبوون مرۆ مافی سروشتی نیە. مرۆ پاش ئەوەی لە دایك بوو، دەبێتە مرۆ. چونکە دەگەڵ خەڵکی تر دایە چونکە خەڵکی یارمەتی دەدەن، چونکە دایکێك، ژن یان پیاوێك یان هەر کەسێکی تر نان خواردن و رێگە رۆیشتن و قسە کردن وبیر کردنەوە و هەڵسوکەوتی مرۆڤێکی فێر دەکا. بچکۆلە، تەنیا شتێکی من و تۆ پێکەوە گریٚ دەدا پەتێکی نێوکی بیٚ نرخە. من و تۆ

جوتێك نین. ئێمە یەك زاڵم و یەك مەزڵوومین. ئەتۆ زاڵمی و منیش مەزڵووم. وەك زێرروو خۆت پێوە نووساندووم و، زگ و خوێن و هەناسەم بە تالآن دەبەی، ئێستاش دەتەوێ گیانم لێ بستێنی. ئیزنت پێ نادەم و، ئێستا کە ئەو راستیانەم پێ وتی، قسەی ئاخیرم دەکەم: پێویست ناکا منداڵم هەبێ. من قەت نێوانێکی ئەوتۆم دەگەڵ منداڵ نەبووە! قەت سازانم دەگەڵ منداڵ نەبووە. تەنانەت بە بزەوە لێیان نزیك دەبمەوە دەست دەکەن بە گریان. من بۆ دایك ناشێم. من ئەرکی ترم سەبارەت بە ژیان هەیە. کارێکم هەیە ئۆگری ویم و، پێم خۆشە دوای کەوم دوارۆژم چاوەرێمە؛ حەز ناکەم پشت گوێی بخەم. ئەو مرۆڤانەی ژنێکی بێ دەسەڵات و بێ دەنگیان تەنیا لە مەڕ ئەوە وەخۆناگرن چونکە نایەنەوێ منداڵی تریان ببێ دەبێ ببورن من لەم جۆرە کەسانە نیم. یان ئەو جۆرە کچە فەقیر و بێ دەسەڵاتانە نیم دەست درێژی کراوەتە سەرو حاشا لە بەرهەمی تاوانیان دەکرێ و، پێوەندیان دەگەڵ دەپچڕێندرێ. تەنیا هەژاری و دەست درێژی کرانە سەر هۆ نین بۆ پاساوی ئەم کارانە.

ئەم نەخۆشخانە نەفرین لێکراوە جێ دێلم و دەچمە سەفەرەکەم هەرچی دەبێ بابێ. ئەگەر توانای هاتنە سەر دنیات هەبێ ئەوە لە دایك دەبی. ئەگەریش نا، ئەوە دەمری. من ناتکوژم: تەنیا یارمەتیت پێ ناکەم ناچمە ژێر باری مەبەستە زاڵمانەکەت و...

تێ دەگەی قەرارێکی وامان دەگەڵ یەکتری نەبوو. هەر پەیماننامەیك کە دوو لا لە سەری رێك دەکەون شەرتی ئەوەیە شتێکی دەدەن شتێکی تری لە بری وەر دەگرن. من کاتێ ئەم پیماننامەیەم ئیمزا کرد، نەمدەزانی تۆ هەموو شتێکت دەوێ و هیچیش نادەی بە من. هەروەها تەنیا من ئەو پەیماننامەیەم ئیمزا کردوە و، ئەمەش نرخی پەیماننامەکە خەوش دار دەکا. ئەتۆ پەیماننامەکەت ئیمزا کردو قەت پەیامێکت بۆ نەناردم. تەنیا پەیامێك لە تۆوە بە من گەیشت، هەر ئەو پەڵە خوێنە ئاماڵ سوورە بوو. لەعنەت لە من، ئەگەر ئەمجارە بڕیارەکەم بگۆرم. تەنانەت ئەگەر ئەم هەڵوێستە ببێتە هۆی پەشیمانی و ئازارێکی نەبڕاوە.

*** *** ***

دوکتور پێی وتم تۆ ئینسان کوژی. بەو بلوزە سپییەوە دوکتور نەبوو قازی بوو. پێی وتم سەرەکی ترین ئەرکەکانم وەك ژنێك وەك دایکێك وەك هاولاتییەك بە جێ نەگەیاندوە. بە سەری دا ڤیژاندم هەر ئەوەندە کە نەخۆشخانەم جێ هێشتووە و پشووم نەداوە بە تاوانێکی گەورە دادەندرێ جا بگا بەوەی ویستوومە بچمە سەفەرە گرینگەکەم. وتی یاسا دەبێ وەك قاتلێك سەیری تۆ بکا. پاشان برێك هێدی بۆوە ویستی بە نیشان دانی وێنەکانت لە بڕیارەکەم پاشگەزم بکاتەوە. ئەگەر بڕە هەستێکم هەبا بە باشی دەمبینی: ئەتۆ منداڵێکی تەواو بووی. دەم و لوتت خەیاڵی نەبوون، راستی بوون. روخسارت کێشانەوەی روخسارێك نەبوو. هەر وەها جەستەت و دەست و لاقەکانیشت؛ نینۆکت هەبوون. سەر چکۆلەکەشت کە رێك جوان بوو چەند دانە تاڵە مووی پێوە بوون. زۆر سەیری پێستم کردی: پێستت ئەوەندە ناسك و سپی و تەنکە رەگ و ریشاڵ و دەمارەکانی تێدا دیارن. ئەتۆ چکۆلە نی: شازدە سانتی میتری و ڤورساییت دووسەد گرەمە. ئەگەر تەمای هەڵکەندنتم هەبوو دەبوو پێش لە ئێستا بمکردایە، ئێستا درەنگ بووە. بەڵام بۆ شتی زۆر خراپتر لە لەبار بردن خۆم ئامادە کردبوو. بێ ئەوەی چاو بتروکێنم گوێم بۆ قسەکانی گرت. پاشان وەرەقەیەکی بۆ ئیمزا کردن پێ دام. بە پێی ئەو نووسراوەیە دوکتور لە بەرامبەر من و تۆدا هیچ بەرپرسایەتییەکی نەدەکەوتە سەر شان و بە ئیمزاکردنی ئەو وەرەقەیە من بەرپرسی ژیانی هەردووکمان بووم. لە کاتێکدا تووڕە بوون لە چاوانی دەباری لە هۆدەکە چوە دەر، هەر لەو کاتە دا بوو تەکانێکی توونت بە خۆت دا. ئەوەی لە مێژ بوو چاوەرێم دەکرد، تێت گەیاندم. نازانم دەست و پێت جولاند یان باوێشکت دا، هەر چۆنێکی بێ لاقێکی چکۆلەی پڕ مانات لێدام. یەکەمین لاق. وەك ئەو لاقە دەچوو من لە دایکم دابوو و داوام لێکرد فرێم نەدا. لاقەکانم وەك دار رەق بوون. بۆ چەند ساتێك توانای

هەناسە كێشانم نەبوو و، تەنیشت چاوانم گەرم داهاتن. سوتانێكی سەیرم لە گەرومدا هەست پێ كرد. فرمێسك لە چاوانم دا قەتیس مان. پاشان بەسەر گۆناكانم دا هەڵخلیسكان و كەوتنە سەر مەلافەكە! بەڵام لە تەختە خەوەكە هاتمە خوارو ساكەكەم ئامادە كرد. بەیانی دەڕۆم. بە فرۆكە.

*** *** ***

لە تۆ دەپرسم، لە خۆڕا ئەم ماوەیە خۆم و، تۆشم تووشی ئازارێكی بە خۆڕایی نەكرد؟ لێرە لەم وڵاتەدا كە پێكەوە سەفەرمان بۆ كردوە تەندروستی هردووكمان لەو پەری باشی دایە. لە ڕێگەداو پاشانیش هیچ رووی نەدا، تەنانەت جارێكیش هەستم بە ژان و دڵ تێكەڵ بوون نەكرد. بۆچوونەكانی دوكتور بەو شێوەیەی ئەو دەیگوت وا نەبوون. دوێنێ خانمە دوكتورێك سەیری‌كردم، ئەویش دەگەڵ بۆچوونی من بوو. هێندێك خۆی دەگەڵ زگم خەریك كرد و وتی دوكتۆرەكەی پێشووت زۆر بەدبین بووە و ئیحتیاتی كردوە. ئەی ئەو پەڵە خوێنە چ بوو؟ ئەو دەیگوت هێندێك ژن لە ماوەی زگ پڕی دا پەڵە خوێنی وا دەبینن، سەرە ڕای ئەوەش منداڵەكەیان ساغ و سلامەت دێتە دنیا. بە ڕای وی پشووی بەردەوام بۆ ژنی زگ پڕ پێچەوانەی سروشتە، زێدەڕۆیی لە ئیحتیاتیش دا هەر وایە. بۆ وێنە یەكێك لە نەخۆشەكانی هەتا مانگی پێنجەمی زگ پڕی كارەكەی كە زۆر قورس بوو واز لێ نەهێنابوو و هیچ روداوێكی ناخۆشیش رووی نەدابوو. پێی زتم دەتوانم دەرمانەكانی دوكتوری پێشووم بخۆم. بەڵام وتی باشتر وایە هەموو شتێكی بە سروشت بسپێرم. تەنیا ڕێنوێنی ئەوە بوو ماشێن لێ نەخورم. پێم وت سەفەرێكی دە ڕۆژم بە ماشێن لە پێشە. چاوی پێ زەق بوون و پرسی بە راستی ئەم سەفەرە دەبێ بكرێ؟ وتم بەڵێ. ماوەیەك بێدەنگ بوو پاشان وتی قەیدی ناكا، ڕێگەكانی ئێرە ساف و بێ تاسەن و، ماشێنەكانیش نەرم و خۆشن. گرینگ ئەوەیە زۆر فشار بۆ خۆم نەهێنم و، هەر سێ كاژێر جارێك پشوو بدەم. گوێت لێیە چی دەڵێم؟ پێت دەڵێم دەگەڵت ئاشت بوومەوە و، وەك جاران هاورێی یەكترین! داوای لێبوردنت لێ دەكەم ئەم ماوەیە دەگەڵت خەراپ بووم ئەگەر دڵڕەنجاو بی و لاق لە زگم نەدەی منیش لێت دەرەنجێم. لە پاش نەخۆشخانەوە لاقت لێ نەداوم. جار جارە بیر لەمە دەكەمەوە حاڵم تێك دەچێ.

بەڵام زوودێمەوە سەر خۆ. زوو هێور دەبمەوە. ئاگات كردوە چەند گۆڕاوم؟ لەو كاتەوە ژیانی ئاسایی و جارانم دەست پێ كردۆتەوە هەست دەكەم ئینسانێكی ترم؛ وەك پەرەسێلكەیەك تازە باڵە فڕە بووە. تۆ بڵێی بە راستی مەرگم بە ئاوات دەخواست؟ شێت نەبووم؟ ژیان و تیشك هەردووكیان جوانن. دارەكان و زەوی و دەریاكان جوانن. ئێرە دەریای لێیە. بۆن و بەرامەی هەست پێ دەكەی؟ كاتێ ئینسان هەست بە شادی دەكا كار كردن زۆر خۆشە؛ ئەو كاتەی دەمگوت كار ماندووت دەكاو سووكایەتیە، درۆم دەكرد. دەبێ بم بوری. توورەیی و نیگەرانی هەموو شتێكی لە پێش چاوان رەش كردبووم. دەمەوێ هەرچی زووتر لەو تاریكی‌یە رزگارت كەم و هەر بۆیە ئارامم نەماوە، بەم كارەم لەوانەیە ئەو هەموو دڵساردییەی لە قسەكانم دا لە مەر ئازادی و تەنیای پێم وتی پێ دەچێ كاریگەری خراپی لە سەرت بوو بێ؛ دەمەوێ لە نێویان بەرم. ئەم قسە قۆڕانە لە بیر بكە؛ پێكەوە بوون گەلێ باشە. ژیان كۆمەڵگایەكە دەبێ تێیدا دەست لە دەست یەكتر نێن، یارمەتی یەكتری بكەین و دڵداری یەكتری بدەینەوە.

گیاكان بە كۆمەڵ گوڵیان زۆرترە و باڵندەكانیش پێكەوە دەفڕن. ماسیەكانیش بە كۆمەڵ لە نێو ئاودا دەگەڕێن و مەلە دەكەن. بە تەنێ چیمان پێ دەكرێ؟ لە تەنیایی‌دا وەك ئەو فەزانەوەردانە دەچین كە لە سەر مانگ لە بەر ترس و مەیلی گەڕانەوە هەست بە خنكان دەكەن. خێرا كە دوایین مانگەكانی بەرەو لە دایك بوونت زوو تێپەر بكە. بێ ئەوەی لە بینینی خۆر بترسی.لە سەرەتادا تیشك لە چاوانت دەچەقێ و دەبێتە هۆی سەر سوورمان و ترست. بەڵام زوو پێی رادێی و ئەوەندە خۆشت گەرەك دەبێ بێ ئەو ناتوانی بژی. داوای لێبوردنم هەیە كە هەر دەم خراپترین شتەكانم بە نموونە هێناوەتەوە. دەمتوانی بۆت باسی ئاوا بوونی خۆر و، شیرنی ماچ و بۆنی خۆشی خواردن بكەم. زۆر لەمە

**پەشیمانم نەمتوانیوە بە قسەکانم وە پێکەنینت بخەم. ئەگەر لە سەر قسەکانم مـن هەڵسەنگێنی منـت پـێ حیفریتێکی ڕەشە. لەمەو بـە دوا دەبـێ وەك ((پیتـرپـان)) کـە هەمیشـە جل و بـەرگی زەرد و سـەوز و سـوور دەکاتـە بـەری و لـە سـەر گوێسەبان و زەنگی کلیساکان و لە سەر هەورەکان گوڵان هەڵدەرێژێ سەیر بکەی. پێکەوە بوونمـان بەختـەوەریمان بـۆ بـە دیاری دێنـێ. چونکە ئەگـەر راستیەکەت دەوێ منـیش منـداڵم. زۆر حـەزم بـە گاڵتـە کردنـە. دوێ شـەو کاتـێ گەرامـەوە هۆتێل جێگەی ئـەو پێڵاوانـەی کـە بـۆ بۆیـاغ کـردن لـە بـەر دەرگـا داینـابوون گۆڕین. هەروەها کاغەزی داواکاری نـان خواردن کە لە بەر دەرگا داندرابوون، جێگەی ئەوانیشم گۆڕی. ئەمرۆ بەیانی غەڵبـە غـەلبێك دروست بـوو مەگـەر خـودا بزانـێ، خانمێك کـە جوتێك پـێلاوی پیـاوانی بـە دەسـتەوە بـوو بـە تووڕەییـەوە بـە دوای پـێڵاوە پاشـنە بلینـدەکانی دا دەگەڕا. پیاوێك جوتێك پێڵاوی تێنیسی لـە بـەر دەرگاکـەی خـۆی هـەڵگرتبوون بـە دوای چەکمەکانیدا دەگـەڕا. یـەکیتر دەیگوراند لە جیاتی هێلکە و ژامبۆن چایەکی تاڵیان بۆ هێنابوو. یەکیتر سکاڵای بەرز ببۆوە تـەنیا داوای چـایی کردبـوو: بەڵام قاوڵتی نوئێلیان بۆ هێنابوو. گویم بە دەرگاوە نابووو، دەستم بە دەمـم گرتبـوو لـە بـەر خۆمـەو ئەوەنـدە پێکـەنیم هەستم کـرد گەراومـەوە سـەر دەمـی شـیرنی منـداڵیم؛ ئـەو سـەردەمەی هـەموو شـتێك مانـای یـاری پـێ دەبەخشـیم و، بەختەوەر بووم.**

***** *** *****

**لانکەیەکم بۆ کریوی. هێندێك کەس لە سەر ئەو بروایەن ئەگەر پێش لە دایك بـوونی منـداڵ لانکـەی بـۆ بکـری وەك دانانی گوڵە لە سـەر تـەختی نـەخۆش کـە شـوومی خەراپـە، بـەڵام مـن بـروام بـەو قسـە خورافیانـە نیـە. لانکەکـەت وەك لانکی سوور پێستەکانە. دەتوانی منداڵەکەی بخەیە نێـوی و لـە کۆلیشـی بەسـتی. ڕەنگـی وەك ڕەنگـەکانی پیتـرپـان زەرد و سوور و سەوز. لە سەر قەڵاندۆشکت دادەنێم و بۆ هەمووجێگەیـەکت دەبـەم. خـەڵك بـە پێکەنینـەوە دەڵێن سـەیری ئـەم دوو منداڵە شتە بکەن. جل و بەرگیشـم بـۆ کریـوی: ژێـر کـراس، لیباسـی یەکسـەرە و، قووتوویـەك کـە مۆسـیقای والسـی تێدایـە کاتـێ سـەرەکەی لا دەبـەی دەسـت دەکـا بـە لێـدان. کاتـێ بـە تەلـەفۆن قسـەم دەگـەڵ هاورێیەکـەم کـرد وتـی مـن مرۆڤێکی ئاسایی نیم. بەڵام دەنگەکـەی ڕەزامەنـدی پێـوە دیـار بـوو و لـەو نیگەرانیـە رزگـاری ببـوو پـێش سـەفەرەکەمان هەیبوو: نەکا لە فرۆکە دا منداڵەکەت لە دەست بدەی؟ ئەمە هەر ئەو کەسـەیە لـە سـەرەتا دا پێشـنیاری دەکـرد بتکوژم. زۆر ژنێکی دڵ پاکە. ئەو رۆژەی باوکتی ناردبووە لامـان نـەمتوانی لێـی تـووڕە بم. دەزانـی سـەبارەت بـە باوکت چۆن بیر دەکەمەوە؟ ئەو پیاوە کە وەدەری دەنێن، مل دادەخا و هیچ ناڵێ و، وە دەر دەکەوێ، پیاوێکی باشە.**

**پاشان نامەی بۆ ناردم. دانی بەوە دانابوو خەتای کـردوە. بـەڵام چـونکە پیـاوە دەبـێ ببیـورم. پـێم وایـە غەریزەیـەکی ڕەگەزی وای لێکردوە ئەتۆی بوێ. پاشـان بـیر لەمـە دەکەمـەوە وەك موبلێـك دەچـێ هـیچ پێویسـتێکت پـێ نیـە بـەڵام لـە جێگەیەکی هەر بە کەڵکت دێ. دڵنیایـە دوژمنایـەتیم دەگـەڵ نیـە. کەسـانی تـریش لـە نـەمانی ئـەم شـەڕە دا بەشـداریان هەیە: ئەو، دوکتورەکان، بەرێوەبەرەکەم. ئەگەر دەزانی کاتێ بـە بـەرێوە بەرەکـەم راگەیانـد دەچـمە سـەفەرەکەم چـەندە گەشایەوە. زوو زوو دەیگوت: ((هەوالێکی خۆشت پێ بوو! هەر بژی، دڵنیا بە لەم سەفەرەت پەشیمان نابیتەوە.))**

**پەشیمان نابمەوە مرۆ هەتا ئەو کاتە رێزی لێ دەگیری کە بۆ خۆی ڕێز لە خەڵکیتر بگـرێ و تـەنیا بـروا بـە خۆبوونـە دەبێتە هۆی ئەوە خەڵکانیتر بروایان بە مرۆ دروست ببـێ. شـەو خـۆش بچکۆلە. بـەیانی سـەفەر بـە ماشـێن دەسـت پـێ دەکا. حەز دەکەم هۆنراوەیەکت بۆ بخوێنمـەوە کـە باسـی گەرانـەوەی ئـارامی، گەرانـەوەی دڵنیـایی، بـە گـول ڕازانـدنـەوەی پشتەبان و زەنگەکانی کلیسا و هەورەکان بکا، باسی فرینی پەرسێلکی لە ئاسمانا بکـا، بـە دوور بـێ لـە نزمـی و خەمـەکان، لە بەرزی لە سەرووی ئاوی زوڵاڵی دەریـا، قسـانت بـۆ بکـەم. لـە راسـتی دا، غـیرەت یەکسـانە بـە گـەش بینـی. مـن گەشـبین نەبووم چونکە بە غیرەت نەبووم.**

*** *** ***

ڕێگەکانی ئەم وڵاتە ساف و ڕێکن. ماشێنەکانیشی نەرم و ڕاحەت: خانمە دوکتور ئێوەش خۆتان فریوو دەدەن. بچکۆلە چی بکەم منیش پەرسێلکە نیم. بەرەو پێش بڕۆم یان بگەڕێمەوە؟ ئەگەر بگەڕێمەوە خراپترە: دەبێ ئەو ڕێگە ناخۆشەی بریومە دوبارە پێیدا بڕۆمەوە. ئەگەر بەرەو پێش بچم ئومێدی ئەوە دەکرێ ڕێگەکە خۆشتر بێ. ئەگەر غیرەتم هەبێ کە ڕاستگۆ بم، دەبێ بڵێم بە ڕێگەیەك دا دەڕۆم وەك ژیانی خۆم وایە پڕ لە هەوراز و نشێو و، بەردەڵانە. جارێکیان دەگەڵ نووسەرێك ئاشنا بووم دەیگوت: ژیانی هەر کەس شیاوی خۆیەتی. واتە هەزار شیاوی هەژارییە و کوێر شایانی کوێری. پیاوێکی نەزان بوو، ئەگەر چی نووسەرێکی وریاش بوو. ئەو هێڵەی سنووری نێوان زیرەکی و کەریەتی دیاری دەکا، هێڵێکە لە مووش باریکترە. لە ئاکام دا ئەگەر ئەم هێڵە نەمێنێ چ پیاو بێ چ ژن ئەم دوو بابەتە تێکەڵی یەکتری دەبن. وەك ئەوین و نەفرەت، مەرگ و ژیان. سەر لە نوێ ئەم پرسیارەم بۆ دێتەوە گۆڕێ کچی یان کوڕ؟ ئێستا پێم خۆشە کوڕ بی. هەر نەبێ لە قۆتابخانەی مانگانەی خوێن ڕزگارت دەبێ و، قەت بە ماشێن لێخورین لە ڕێگەیەك دا تاسەی و چاڵ و چوڵی زۆرن، زەحمەتت پێ ناگا. قەت وەك ئێستای منت بە سەر نایە. دەتوانی زۆرتر لە من بە ئاسمان دا بفری. هەوڵی من بۆ فرین تەنیا پەلەقاژەیەکە. ئەو ژنانەی مەمك بەندەکەیان ئاگر دەدەن حەقیانە. زۆریشیان حەقە. هیچ کامیان ڕێگەیەکیان بۆ نەدۆزراوەتەوە ئەگەر هات و نەیانتوانی منداڵیان ببێ دنیا کۆتایی پێ نەیێ. منداڵ لە ژن دەبێ. چیرۆکێکی زانستی خەیالیم خوێندۆتەوە کە لە ئەستێرەیەك دا بۆ ئەوەی زاوزێ بکرێ حەوت کەسی پێویست بوون. بەڵام پەیدا کردنی حەوات کەس زۆر ئەستەم بوو لەوەش ئەستەمتر ئەوە بوو ئەو حەوت کەسە ڕێك نەدەخران، چونکە نەك هەر جووتك کردنی نووتفە بەلکوو دەبوو هەڵگرتنەکەی ئەم نووتفەیە هەر حەوت کەسیان تەحەمووڵی بکەن. کە واتە ڕەگەزی دانیشتوانی ئەستێرەکە بەرەو لە نێو چوون دەچوو و، ئەستێرەکە کەسی تێدا نەدەما. چیرۆکێکی تریشم خوێندۆتەوە کە قارەمانی ئەو چیرۆکە وەك گیراوەیەکی ترش یان بوتڵێك ئاوی خوێی دەخواردەوە و لە نێوەوە دەتەقی و خاو دەبۆوە! دەبوو بە دوو کەس. خانەکان بە شێوەیەکی سروشتی دابەش دەبون و، قارەمانی چیرۆکەکە لە کاتێك دا دوو لەت دەبوو وەك خۆی نەدەما! ئەو بە جۆرێکی کەسایەتی خۆی دەکوشت. بەڵام نەدەمردوو، نۆ مانگیش دەرد و عەزابی نەدەکێشا. نۆ مانگ کوێرەوەری بۆ هێنیدێکیان نۆ مانگ سەروەرییە. باشترین ڕێگە ئەو ڕێگەیەیە یەکەم جار پێم وتی: وا باشتر بوو لە منداڵدانم دەریانهێنابای و لە منداڵ دانی ژنێکی تریان نابای کە لە سەرخۆتر، دڵسۆزتر و بە تواناتر بوو لە من.تەبم هەیە. ژانی ماسوولکەکانم دەستی پێ کردوە، نابێ گوێی پێبدەم. چۆن دەکرێ گوێی پێ نەدەم؟ خۆم بە شتیتروە خەریك بکەم. چیرۆکێکیترت بۆ دەگێڕمەوە. لە مێژە چیرۆکم بۆ نەگێڕاوییەوە. هەبوو نەبوو ژنێك هەبوو بە ئاواتەوە بوو پارچەیەکی بچوکی لە مانگ هەبێ. بگرە بە تۆزقالێکیش ڕازی بوو. هیوایەکی سەرسوور هێنەر و چاوەڕواننەکراو بوو. ئەو خەڵکی دەناسی چووبوونە مانگ. ئەو ڕۆژگارە چوونە مانگ بوو، بوو بە مۆدی ڕۆژ. ئینسانەکان لە کون و کەلەبەری دنیا سواری کەشتی ئاسمانی دەبوون کە بە سەری مووشەکێکەوە نرابوون. هەر جارەی مووشەکێك بەرەو ئاسمان دەتەقێندراو گرمەی لێ دەهات و ئاگری لە دواوە دەردەپەڕاند ژنە لە خۆشیان دەگەشایەوە. ژنەکە ڕووی لە مووشەکەکە دەکرد و هاواری دەکرد: ((بڕۆ! بڕۆ بەرەو مانگ!)) لە حەسوودی ئەو کەسانەی سەفەری مانگیان دەکرد دەلەرزی و، سێ شەو و ڕۆژان ئاگای لە هەواڵی ئەو کەسانە بوو لە تاریکاییدا سەفەرەکەیان درێژە دەدا. ئەو مرۆڤانەی سەفەری مانگیان دەکرد زۆر نەزان بوون. ڕوخساری ئەحمەقیان وەك بەردی لێهاتبوو. گریان و پێکەنین ڕووی تێنەدەکردن. مانگ لە بیری ئەواندا تەنیا بابەتێکی زانستی و، سەرکەوتنێکی تیکنۆلۆژیك بوو و هیچیتر. لە ماوەی سەفەرەکەیان دا دوو قسەی بە جێیان نەدەکرد. ـ تەنیا ژمارە و هاوکێشەو زانیاری ئیزعاج نەبێ ـ ئەگەریش قسەی ئینسانانیان لە دەم دەهاتە دەر بۆ ئەوە بوو لە سەر ئەم تیپی دوو

گوڵی یان ئەو تیپ پرسیاریان دەکرد. کاتێ دەگەیشتنە مانگیش هیچیان بۆ وتن پێ نەبوو تەنیا چەند رستە کە پێشتر ئامادەیان کردبوو کاوێژ دەکردەوە. پاشان ئالایەکی ئاسنی سپییان دەچەقاند و، وەك رۆبات هێندێك جولانی بێمانایان دەکرد. لە پاش هەموو ئەوانە مانگیان بە پاش ماوەی پیسیان پیس دەکرد و، بۆخۆیان دەگەرانەوە و پیساییەکەیان لە وێ جێ دەما بۆ ئەوەێ شاهیدی هاتنە ئینسانەکان بێ بۆ سەر مانگ. پیساییەکەیان لە قووتوو دەکرد. قووتوەکان دەگەڵ ئالاکان لە وێ دەمانەوە. ئەگەر ئەمەت زانیبا و سەیری مانگت کردبا نەت دەتوانی نەڵێی: ((ئەو سەرە پڕە لە پیسایی ئەوان)) لە گەرانەوەیان دا بۆ سەر زەوی تورەکەی پڕ لە گڵ و بەردیان دەگەڵ خۆیان دێنایە سەر عەرز. ئەو گڵەی ژنەکە بە ئاواتیەوە بوو. کاتێ ژنەکە دەیدین لێیان دەپارایە (مـن دەپاڕامەوە) : ((تۆزقاڵێك لەو گڵ و بەردەم نادەنێ، ئێوە زۆرتان هەیە!)) بەڵام ئەوان هەمیشە دەیانوت: ((ناکرێ ئیزنمان پێ نیە!))

هەموو تاقی کردنەوەکان لە سەر مێزی ئەو کەسایەتیانەدا دەکرا کە وەك بابەتێکی زانستی و سەرکەوتنێکی تێکنۆلۆژیك باسی مانگیان دەکرد. ئەوانە نەزان بوون، چونکە رووحی ئینسانیان نەبوو. بەڵام لە نێو گەشتیارە ئاسمانیەکاندا کەسێك هەڵدەکەوت لەوانیتر باشتر بێ. چونکە دەیزانی گریان و پێکەنین چیە. پیاوێکی ترسنۆکی کورتیلە و ناشیرین کە ددانەکانی خوارو خێچ بوون. بۆ ئەوەی ترسەکەی بشارێتەوە دایمە پێدەکەنی و کلاوێکی قەشمەری لە سەر دەنا کە رەنگ و روویەکی پێدەدا. لە بەر ئەم شتانە و لە بەر ئەوەی دەیزانی شایانی چوون بۆ مانگ نیە دەگەڵی ئاشنا بووم. کاتێ چوومە لای هەر پرتە پرتی بوو و، دەیگوت: ((باسی ئەو سەرەت چۆن بۆ بکەم. شاعیر نیم ناشزانم وشەی جوان و رێك و پێك بکار بێنم.))

چەند رۆژ بەر لەوەی بچێتە مانگ هاتە لام و خواحافیزی لێکردم و لێی پرسیم لە مانگ چی بلێت. پێم وت دەبێ قسەیەکی راست و بەشەرەفانە بکا. بۆ وێنە بلێ پیاوێکی چکۆلە و کەمە چونکی ترسنۆکە. ئەم قسەیەی پێ خۆش بوو و، سوێندی خوارد ئەگەر گەرایەوە هێندێك گڵی مانگم بۆ بێنێ. رۆشت و گەرایەوە. بەڵام بە تەواوی گۆرابوو. هەر جارەی تەلەفۆنم بۆ دەکرد و، دەمویست بەڵێنەکەی بیر بخەمەوە خۆی گێل دەکرد. شەوێکی بۆ نانخواردنی شەو بانگ هێشتنی کردم. بە پەلە چووم و پێم وابوو ئاخرەکەی بریارەکەی خۆی دەباتە سەرێ هەتا تۆزێکم لە خاکی مانگ بە دیاری بداتێ. لە سەر نان خواردن سەبر و قەرارم نەما و نانم پێ نەخورا. لە نان خواردن بۆوە وتی: ((ئێستا مانگت نیشان دەدەم)). بەڵام نەیگووت مانگت دەدەمێ. هەستم بە جیاوازی ئەم دوو رستەیە نەکرد. کلاوە سەیرەکەی هەر لە سەری بوو و هوروا پێدەکەنی پێم وانەبوو ئەو تۆزە رووحەی مـن تێمدا شك دەبرد ئەویشی لە ئاسمان لە دەست داوە.

چاوێکی لێ داگرتم و بەرەو هۆدەی کارەکەی رێنوێنی کردم. دەتگوت گاڵتە دەکا دەرگای قاسەیەکی بە کلیلە کردەوە. لە نێو قاسەکەدا زۆر شتی تێدا بوون، بێل و پاچ، لولە، خۆڵێکی سەیر کە رەنگی نووقرەیی تێر بوو لێیان نیشتبوو.خۆڵی مانگ. دڵم وە کوتە کوت کەوت، لێدانی دڵم چووە سەرێ بە دڵە کوتەووە دەستم بۆ بێڵەکە درێژ کرد و هەڵم گرت. بێڵێکی سووك بوو و قوورساییەکی وای نەبوو. خۆڵەکەی وەك تۆزی ئاردە برینجی کوتراو دەچوو، گەلێ نەرم بوو. کاتێ لە سەر دەستت دەنیشت دەتگووت پێستێکیتر لە جنسی نووقرە بە سەر پێستت داکشاوە. ناتوانم بە هیچ وشەیەك ئەو هەستەی کە خۆڵی مانگ کەوتە سەر پێستم دەر ببڕم. دەتگووت لەو کاتە دا بە فەزا و زەمان دا بڵاو بوومەوە، دەتگووت شتێك کە دەست نەدەکەوت، واتە ئەبەدییەت، دەستم راگەیشتوە؛ ئەمانە ئێستا بە بیرم دادێن. چونکە ئەو کاتە هێزی بیر کردنەوەم نەبوو. ئێستاش کە ئەو رۆژەم بیردێتەوە ناتوانم ئەو هەستەم دەربڕم کاتێ بێڵەکەم هەڵگرت بۆ ماوەیەك مات و دامام و، ئاگاشم لەوە نیە سەبر و قەراری لێبرابوو. لەوە دەترسام ئەو گەنجەی کە ئامادە نەبوو بیرەوەریشی بە کەسێ بلێ لێی بدزم. کاتێ ئەوەم هەست پێ کرد گەنجەکەم پێ دایەوە و لە بەر خۆمەوە

وتم. ((سوپاسـت دەکـەم. ئێسـتا هێنـدێکم خـۆڵی مـانگ بدەیـە)) زوو تێـك چـوو. ((کامـە خـۆڵی مانگـە؟)) هـەمان خـۆڵی مانگ کە بەڵێنت پێ دابووم.)) وتی: ((ئێستا پێم نەدای سەیرت کرد.)) پێم وابوو گاڵتەم دەگەڵ دەکا.چەند چرکەیەك کە بە چەند ساڵ دەبوو رابورد هەتا تێگەیشتم بـە گاڵتـەی نیـە و بەڵێنەکـەی بەمەنـدە کۆتـایی پـێ هێنـا. کەوتمـەوە بـیر ئەو هەژارانەی تەنیا لە پشتی ویترینی زێرینگەریەکانـەوە سـەیری زێـر دەکـەن، یـان لـە دوورەوە سـەیری جێـژن و شـادی دەکەن و مافی ئەوەیان نیە تێدا بەشدار بن. لە جێگەی خۆم وشـك بـووم و جووڵـەم لێبرا. وام لێهـات تەنانـەت نـەمتوانی ئـەو کلاوەی لـە سـەری نـابوو بـە دەموچـاویدا بکێشـم. تـەنیا لەبـەر خۆمـەوە دەمگـوت: ((بریـا بمتوانیایـە تێیبگەیـەنم چەندە ناپاك و ناراستە)). بەم هیوایە ئەحمەقانەیەوە بـە پارانـەوە و تکا ویسـتم بڵـێم مـن تـەنیا تۆزێـك تـۆز و غوبـارم گرەك بووە. ئەو خۆڵەی بۆ خۆی بەڵێنی پێدابووم و ئەویش ئەوەندەی لی قاسەکەیدا هەبوو تـەنیا پێویسـت بـوو ئیـزنم پێ بدا هێندێکی لە پارچە کاغەزێکی بکەم. هێندێك خۆڵ کە لـە سـەر دەسـتم نیشـتوە بـەس نیـە. هێنـدێکم گەرەکـە لـە کاغـەزی بکـەم بـۆ ئـەوەی بتـوانم پاشـان سـەیری بکـەم و هـەتا هـەم لای خـۆم رایگـرم. ئـەو دەیزانـی ئەمـە ئـاواتێکی لەمێژینەی منە و، هەوا هەوەسێکی کاتی نیە. بـەڵام هـەتا زۆرتـر دەپارامـەوە و، خـۆم بچوکتر نیشـان دەدا ئـەو قـایم تـر بوو لە سەر قسەی خـۆی. بـە چاوە سارد و بـێ گیانـەکانی تێمـەوە رامـابوو و قسـەیەکی نـەدەکرد. هـەر لـەو بێدەنگیـەدا دەرگای قاسەکەی داخست و وەدەر کەوت. لە هۆدەی میوانداریدا ژنەکـەی لێـی پرسـیم قـاوەی دەخـۆم. سـەرەی پێشـوازی کردن بە قاوە بوو. وڵامم نەدایەوە. بە بێدەنگی سەیری دەستمم دەکـرد کـە خـۆڵی مـانگی لـە سـەر بـوو. مـانگم پـێ بـوو نەمـدەزانی لـە کـوێی دانـیم و چـۆن سـەیری بکـەم. هـەر بـە حـاڵ دەسـتم بـەری کـەوتبا نـەدەما. بـێ هـودە دەمروانـی جێگەیەك بدۆزمەوە هەر چۆنێکی بـێ ئەوەنـدەش بپـارێزم بـە سـەر دەسـتمەوە بـوو. بـەڵام بـرە خۆڵـە وە تـەمێکی بـڵاو دەچوو و لە نێو ئەم تەمەدا رستەیەك بەدی دەکرا ((وەك ئاردی برینـج وایە لـە هـەر شـتێکی بـدەی نامێنـێ.)) ئەمـە بـۆ من گەڵێ دەردێکی بە ئازار بوو، دەردێك کە هەرگیز ((تانتال))* تووشی نە بوو بوو.

کاتێ تانتـالیش دەیەویست میوەیـەك لـە دار بکاتـەوە. میوەکـە لـە بـەر دەسـتانی دوور دەکەوتـەوە. پاشـان بـۆ دواجـار سەیری دەستم، وەك بڵێی فریا کەوتنی گەرەك بێ، کرد. دڵم بۆ گریـان پرببـوو بـە بزەیـەکی تـاڵ کۆتـایم پـێ هێنـا. لـەو دورەدەستانە لە ئەبەدییت، مانگ هاتبوە لام و لە سەر پێستی دەسـتم بـوو. بـەڵام دەبـوو تـورم دابـا، بـۆ هەمیشـە. ئەگـەر گـەرەکم بـا ئـەم خۆڵـە پـاك نەبێتـەوە دوبـارە نەمـدەتوانی هـەموو ژیـانم دەسـتم ئـاوا راگـرم و پەنجـەکانم بـەر یـەکتری نەکەون. درەنگ یان زوو دەستم بەر شتێك دەکەوت ئەو کاتە هەموو شتێك وەك هـەڵم نـەدەما: لـە مـەر گاڵتـە پـێکردنی ئەم دەبەنگە پیسە بوو. بە تووڕەییەوە پەنجەکانم لێـك خشـاند. بـەری دەسـتم هێنـدێك هێڵـی خـوار و خێچـی پیسـی لـە سـەر دەبینـران کـە بـە سـەیر کردنیـان بێـزت هەڵدەسـتا. تـۆ بڵێـی بـۆ گەیشـتن بـەم بێزاریـە ئـەم هـەموو بـە ئومێـدەوە چاوەروان بووم. بەری دەسـتم لـە سـەر قاسـەکە خشـاند پـاش ماوەکـەی وەك پەڵەیـەکی چـەور یـان پـاش مـاوەی چـەوری حەلەزون دەچوو، وەك پاش ماوەی فرمێسکێکی گەورە.

کاتێ لـەوێ رۆیشـتم مـانگ دەدرەوشـایەوە و تریفەکـەی وڵاتـی سـپی هـەڵگێرابوو. بـە چـاوی ئێلـەوە سـەیری دەکـەم و لەبـەر خۆتـەوە دەڵێـی: ((هـەتا شـتێکی سـپی و خـاوێن پەیـدا دەبـێ هـەر زوو پەیـدادەبن بـە پـاش مـاوەی پیسـیان ئـەم سپیەتی و خاوێنیە پیس بکەن.)) پاشان دەڵێی: ئاخر بۆ؟ هەر کە گەیشتمەوە هۆتێل شـێرەی ئاوەکـەم کـردەوە و دەسـتم وەبەر نان. رەشاوێك لە بەر دەستم رۆیشت دەزانی بچکۆلە چیم پێ وتی؟ ئـەتۆ مـانگی منـی. وەك تـۆزی مـانگی مـن. ژان و ئازارم زۆرتر بووە چیتر ناتوانم ماشێن باژووم دەبێ پشوویەك بدەم. لەوانەیە لە رێگەی رووحمەوەو بتوانم رێگە

---

⋆ تانتال ((Tantale)) یان ((Tantalus)) تانتالۆس: له ئەفسانەکانی یۆنان دا، پاشای لیدیا، کوری زێئۆس و باوکی پلۆپۆس. به هۆی ئەو سووکایەتییەی به پاشاکانی کردبوو، زئۆس ئەوی خسته دۆزەخ وه له دۆزەخ دا له چۆمێکی گەورەی هاویشت. لـه سـەر سـەریەوه میـوه هەڵاوەسرابوو. بەڵام سەرەرای برسییەتی و تینویەتیەکی زۆر دەستی نەدەگەیشته ئاو و، میوەکان.

چارەیەك بدۆزمەوه، ئەوەی بۆ رزگار بوون دەشێ رزگاری بکەم. نامەوێ مانگ سەقەت بێ. نامـەوێ جارێکیتر مـانگ لـه دەست بدەم و به کونی لولەی ئاوەکەدا بچێته خوار. بەڵام بێ ئاکامه.هەر وەك ئەو دڵنیایەی ئـەو شـەوه کـه هەسـتم کـرد هەی و دەست و لاقم سارد بوونەوه، ئێستاش هەست دەکەم نیت.

⋆⋆⋆ ⋆⋆⋆ ⋆⋆⋆

وازم له سەفەرەکه هێنا و گەراومەوه شار و تەلەفۆنم بۆ خانمی دوکتـور کـرد. بـروای نـەدەکرد. زوو زوو دەیگـوت: لـه سـەره خـۆ بـه: لـه مـاوەی ئـەم دوو حەوتوویـەدا تەندروسـتیت گـەلێ بـاش بـوو. ئەمـەی تـۆ باسـی دەکـەی تـەنیا خـەیاڵی دروسـتکراوی خـۆتن. لـه وڵامـا وتم ئـەو پەڵـه خوێنـه گەورەیـەی بینـیم خـەیاڵ نـەبوو. حەوتویـەك لـه نێـو رێگـادا لـه هۆتێلێك لامـدا بـۆ ئـەوەی پشـوو بـدەم و لـەوێ ئـەم پەڵـه خوێنـەم دی. پێـی وتم بـێ دوا کـەوتن بچمه لای. کـه وەژوور کەوتم هەمان بزەی گەش بینانەی جارانی له سەر لێوان بـوو. پـێش ئـەوەی پـێم بڵـێ جل و بەرگـەکانم دانـان و لـه سـەر تەختەکه پاڵ کەوتم: ئەویش دەستی له سەر سینگم دانا و، وتـی: (( دڵـت چـەندە زوو زوو لێـدەدا دەڵێـی تەپڵـه.)) گـوێم به قسه به سۆز و بزەکانی نەدا. بەزەیی خەڵکیتر دەردێکـی دەرمـان ناکـا. دڵنیـا بـووم لـه رێ و رەسمێکـی نـەهێنی و بـێ هووده که دەمێك بـوو چاوەرێم دەکـرد بەشـدار بـوو بـووم. ئامـادەی تەسـلیم بـوون بـووم و، لـەوه دڵنیـا بـووم دژکـردەوه نیشان نادەم، چونکه هەر قسەیەکی که دەبوو بیکـەم بـەر لەمـه کردبـووم و هـەموو ئـەو ژان و ئازارانـەی پێویسـت بـوون کێشابوومن. بەڵام کاتێ رێورەسمەکه دەستی پێ کرد ئەوجا زانیم هەرگیز چاوەروانی شتێکی وام نەکردبوو.

پرسیار کردنـی دوکتـور و وڵامدانـەوەکانم ئەوەنـدەیتر ژان و نارەحـەتی بـۆ دروسـت کـردم. ((ئـەم دواییانـه هەسـتت نەدەکرد دەجووڵێ.))، ((نا))، ((زۆر هەستت به قورسایی نـەدەکرد.)) ((نـا))، ((کـەی بـیرت لەمـه کـردەوه کـه،...))، ((لـه رێگەدا پێش گەیشتن به میوانخانه.)) ((بۆ گەیشتن بەم ئاکامه زوویه. دەبێ بڵێم، وانیه؟)) پاشان دەسـتی لـه زگـی دام لـه جاران بێدەنگتره؛ دەستەوانه لاستیکیەکەی له دەستی کرد و به دواتـا گـەرا. بـرۆی تێـك نـانوو چاوی چکۆله کردنـەوه و وتی: ((منداڵ دانت شل بۆتەوه، هەر وەها لاوازیش بـووه! پێدەچـێ منداڵەکـه بـه باشـی گـەوره نابـێ یـان لەوانەیـه هـەر گـەوره نابـێ. دەبـێ تاقیکردنەوەیـەکی بـایۆلۆژیکی بکـەم پاشـان چـەند رۆژێـك بـۆ ئاکامەکـەی سـەبر بکـەین.)) دەستەوانەکەی دەرهێنا و، فرێیدایه سەتڵی زبڵ. دەستەکانی نایه ئەم بەر و ئـەو بـەری تەختەکـه و بـه غەمـەوه سـەیری کردم. ((وا باشتره هەر ئێستا راسـتیت پـێ بڵـێم. حـەق بـه تۆیـه کۆرپەکـه لـه دوو حـەوتوو لەمەوبـەرەوه لەوانەیـه سـێ حەوتووش بێ هەڵینەداوه. ئازابه. هەموو شتێك کۆتایی هاتوه، کۆرپەکه مردوه.))

هیچم نەگوت. نەجولاّم و، چاویشم نەتروکاند. له جێگەی خۆم وەك دار و بـەرد بـێدەنگ بـووم. وەك دار و بـەرد کـه بیر ناکەنەوه. تەنیا شتێك هەستم پێدەکرد قورساییەك بوو له لەشم دا. قورسـایەك کـه نـەدەبینرا و، خـەریك بـوو لـەت و پەتی دەکردم، به بێ رەحمییەوه لەت و پەتی دەکردم. لەو بێدەنگی و نەجولاّنه رەهایـه دا دەنگـی دوکتـور وەکـو تـۆپ له مێشم دا تەقیەوه. ((بە هێـز بـه هەڵسـته بەرگـەکانت دەبەرکـەوه.)) هەڵسـتام. دەسـت و لاقـم وشـك هـەڵاتبوون و، بـۆ جولاّنـدنیان هێزێکی بان مرۆڤی گەرەك بوو. بەرگەکانم دەبەر کردنـەوه و، گـوێم لـه دەنگـی خـۆم بـوو دەیپرسـی. ((چـی بکەم؟)) پاشان دەنگێکیتر وڵامی دایەوه: ((چ نـاکرێ. کۆرپەکـه ماوەیـەکیتر لـەوێ دا دەمێنێتـەوه پاشـان خۆبـەخۆ دێتـه دەر.))

سەرم لەقاند. دوباره هەمان دەنگـم گـوێ لێبـۆوه هێنـدێك رسـتەی بـه دوای یـەك دا ریـز کـردن: نابـێ نارەحـەت بـی. زۆربەی کۆرپەلـەکان چـونکه لـه زگـی داکیـان دا تـەواو نـین هـەر لـه زگی داکیـان دا دەمـرن. نابـێ مـن خـۆم بـه تاوانبـار

دابنێم. نابێ لە بەر ئەو هەڵەیەی تووشی نەبووم خۆم سەر کۆنە بکەم. زگ پڕی کاتێ تەواو دەبێ کە خۆلی سروشتی خۆی بە تەواوی تێپەر بکا و، لە ڕاستی دا شتێکی سروشتی نیە ژنی زگ پڕ بۆ ماوەیەکی درێژ لە سەر تەخت بکەوێ و بەم شێوەیە منداڵەکە دەکەوێتە دۆخێکی ناسروشتیەوە. پارەی دوکتورەکەم دا. بە لەقاندنی سەر ماڵئاوایم لێ کرد و لە هۆدەکە وەدەر کەوتم. بە نێوان دوو ڕیز زگی پڕ دا تێپەڕیم. زگی من کۆرپەیەکی مردووی تێدا بوو هەستم دەکرد گاڵتەم پێ دەکەن. لە دڵی خۆم دا دەموت: ((هەر چی دەبوو ڕوویدا، ڕوویدا، کە اوتە دەبێ تەحەموول بکەم.)) هەتا میوانخانە ڕستەی ((دەبێ تەحەموول بکەم.)) لە مێشکم دا دەزرینگایەوە. کاتێ گەیشتمەوە ماڵ لانکە و لیباس و هەموو ئەو شتانەی بۆم کریبوی دیمن. ئەو هەناسە و ناڵەیەی بە زەحمەت لە دڵم دا رامگرتبوو، ڕشامەوە. بێ هێز کەوتمە سەر تەختەکە. ناڵەیەکی تر لە گەروم هاتە دەر. پاشان چەند ناڵەیتر هەتاوەکو لە قووڵایی دەرونمەوە ـ ئەو شوێنەی وەك پارچە گۆشتێکی بێ کەڵك لە گۆشەیەك سەرت ناوەتەوە ـ ناڵەیەك هاتە دەر و تاشە بەردی گەورەی گریانم بوو بە هەزار پارچە و پارچەکانی بوون بە خۆڵ پاشان نووزەیەك و، لە هۆش خۆم چووم.

*** *** ***

پێدەچێ لە بەر ئەو خەوە بووبێ پاش وە هۆش هاتنەوە تێدا نقووم ببوم. یان لەوانەیە کاتێ وڕێنەم دەکرد. هەر چۆنێکی کاتێ هات: باش لە بیرم ماوە. هۆدەیەکی سپی بوو کە حەوت چرپاو قەفەسێکی تێدا بوو. لە چرپای نێوەراستیان دا ئەو دوکتورەی لێ دانیشتبوو پێش لە سەفەرەکە پێم ڕادەگەیشت. لە لای ڕاستی خانمی دوکتور و لە لای چەپی بەرێوەبەری ئیدارەکەم. لە قەراخ بەرێوەبەر هاورێکەم و پاشان باوکت دانیشتبوو: لە لای خانمی دوکتوریش دایك و باوکم دانیشتبوون. کەسی تری لێ نەبوو. جیا لەمانە هیچ شتێکی تر نە لە دەور و بەرمان نە لە سەر دیوارەکان، نە لە سەر عەرزی نەبوو. زانیم ئەوێ دادگایەکە کە تاوانبارەکەی منم و ئەوانیش لێژنەی دادوەرانن. ترس و وەحشەتم نەبوو. تەسلیمی بێ ئەولا و ئەولا بووم. چاوم بە هەموویاندا گێرا. باوکت هێدی هێدی دەگریا وەك ئەو ڕۆژ کە لە لای تەختەکە دانیشتبوو سەری لە نێو دەستانی گرتبوو. دایك و باوکم سەریان شۆر کردبوو، دەتگووت تووشی ژانێکی کوشندە بوون؛ یان لە بەر هیلاکیان خەریکە دەمرن. هاورێکەم غەمین و لاواز بوو. سێ کەسەکەی تریش پێدەچوو هیچ شتێك کاریان تێ ناکا. لە سەرەتا دا دوکتور هەڵستا و کاغەزێکی خوێندەوە ((لە بەرامبەر تاوانبارکراو دا لێژنەی دادپەروەرانی ئامادە بوو پێك هاتوە، هەتا تاوانبار بە تاوانی کوشتنی بە ئەنقەست و چونکە بە هۆی گوێ پێنەدان و خۆویستی و لە بەر چاو نەگرتنی بە سەخترین مافەکانی مرۆڤ، واتە مافی ژیان، کە بۆتە هۆی مردنی کۆرپەکەی محاکمە بکا.)) پاشان کاغەزەکەی لە سەر مێزەکە دانا و ئەمجار ڕوونی کردەوە دادگا چۆن کارەکانی دەکا. لە سەرەتا دا هەر کامەیان وەك شاهید و قازی شتەکانی خۆیان باس دەکەن و پاشان بە دەنگێکی بەرز دەڵێن: تاوانبار یان بێتاوان. بە وەبەر چاو گرتنی زۆرینەی دەنگ کاتی مەحکوومیەت دا لێژنەی دادپەروەران سزایەکە دیاری دەکا. ئێستا سەرەی قسەکانی خۆیەتی. یەکەمین ڕستەی وەك تەزوویەکی سارد هەڵی کرد.

منداڵ ددانی کرمۆڵ و خراپ نیە. ناکرێ وەك ددانی خەرابوو لە بێخەوە دەری بێنی و لە لۆکەی سپیدا بیخەیتە سەتڵی زبڵەوە، منداڵ ئینسانە، ژیانی ئینسانیش لەو کاتەوەیە دەبێتە نووتفە و هەتا مەرگ درێژەی دەبێ. هێندێك لە ئێوە دەگەڵ مانای بەردەوام بوونی ژیان یەك نین و، دەڵێن: لەو کاتەوە نووتفە دروست دەبێ ناتوانین بڵێین ئەمە ژیانی ئینسانە و دەڵێین ئەو کاتە تەنیا خانەیەکە گەشە دەکا و، سەرەتای ژیان نیە. وەك دارێك کە دەیبڕی، بڕینەکەی تاوان نیە. یان وەك ئەو مێشە دەیکوژی وایە. لە وڵامتان دا وەك زانایەك دەڵێم لە دار یان مێش، ئینسان دروست نابێ. هەموو هۆیەکانی پێك هاتنی ئینسان لە جەستەوە بگرە هەتا کەسایەتی، خوێن و ڕووح لەم خانەیە دا کۆ بوونەتەوە. ئەم هۆیانە لە سەرەوەی ئەندێشە و خەیاڵن. ئەگەر بتوانین ئەم هۆیانە بە مایکرۆسکۆپێك کە ئەو شتانەی لە توانای

**دیتنی چاو دانیە بیانبینین و راڤەی بكەین هەمومان چۆك دادەدەین و، باوەر بە خودا دێنین. كە واتە من هەر لێرە ئیزن بە خۆم دەدەم واتای قاتڵ بەكار بێنم و ئەوەش بڵێم: ئەگەر ئینسان بوون بە پێوەری قورسایی و سووكی بێ و قەتڵ بە كەمییەت، دەتوانین بەم ئاكامە بگەین، كوشتنی ئینسانێكی سەد كیلۆیی تاوانی زۆرترە لە كوشتنی ئینسانێكی پەنجا كیلۆیی. ئەو هاوكارەی لە پەنای من دانیشتوە نابێ بەمە پێبكەنێ. من لێرەدا سەبارەت بە بۆچوونی هیچ نالێم. بەڵام لە بابەتی دوكتوریە ئەحمەقانەكەی دا ناتوانم بێ هەڵویست بم: ((لەم قەفەسە دا لە بری ژنێك دەبێ دوو ژن زیندانی بكرێن.)) پاشان زۆر لێبراوانە روویكردە خانمی دوكتور. خانمی دوكتور لە كاتێكدا لە سەرەخۆ جگەرەی دەكێشا نیگای تەحەموول كرد. ئەم هەڵوێستەی تۆزقالێك گەرما و سوكنایی بە من بەخشی بەڵام هەر زوو با ساردەكە دوبارە هەڵی كردەوە.**

**((بەڵام، ئێمە لێرە بۆ قەزاوەت كردن لە سەر مەرگی خانەیەك كۆنەبووینەتەوە. ئەم دادگایی كردنە سەبارەت بە مەرگی كۆرپەیەكیسێ مانگانەیە. چ شتێك بووە هۆی مەرگی؟ هۆی سروشتی نەبینراوە؟ ئەو شتەی هەست پێناكرێ؟ یان ئەو ژنەی لە قەفەس دا دەیبینین؟ من بەڵگەی باشم هەن ئەمە دەسەلێنین: ئەو ژنەی لەم قەفەسەدایە هۆی مەرگی كۆرپەكەیە. لە خۆوە نەبوو لە یەكەم دیداردا سەبارەت بەم ژنە دڕدۆنگ بووم. بە پێی ئەو ئەزموونانەی كە هەمن منداڵ كوژان لە ژێر دەمامكەكەیانەوە دەناسمەوە. كاتێ ئەو دەیگوت منداڵەكەم دەوێ. دەمامكی لە سەر نابوو. ئەمە درۆیەك بوو پێش ئەوەی بە خەڵكیتری بڵێ دەگەڵ خۆی كردبووی. بۆ وێنە لەوە سەرم سوور ما زۆر لە سەر قسەكەی خۆی سوور بوو. ئەو رۆژەی وڵامم دایەوە ئاكامی تاقیكردنەوەكەی باش بوو سەبارەت بەمە خۆشحاڵیم دەربری ئەو بە ساردی وڵامی دامەوە كە بۆ خۆی ئەمەی دەزانی. هەروەها كاتێ پێم وت لە بەر گرژ بوون و خاو بوونەوەی ماسولكەكانی منال دانی دەبێ بكەوێ و پشوو بدا. ئەو بە تووڕەییەوە وڵامی دامەوەو و، وتی ناتوانێ زیاتر لە پازدە رۆژ لە جێگەدا بكەوێ لێی پارامەوە و تووڕەش بووم، بەڵام بۆم دەركەوت ئەو نایەوێ ئەركی دایكیەتی وە ئەستۆ بخا. ئەو دایكێكی بێ روحم بوو. لە ماوەی ئەم دوو حەوتوویەدا كە لە جێگە دا كەوتبوو بە بەردەوامی تەلەفۆنی بۆ دەكردم و دەیگوت تەندروستی گەلێ باشە و، دەپارایەوە كاری هەیە و دەبێ هەڵستێ. ئەو بەیانیەی دووبارە بینیمەوە تەواو هیوا بڕاو بوو بوو. لەم چاو پێكەوتنە دا بوو لێی كەوتمە شكەوە و، هەستم بە هەوڵە جنایەتكارانەكەی تاوانبار كرد. لە بواری جیسمی و فیزیۆلۆژیەوە پێدەچوو قەڵەویەكی بە هۆی خەم خواردنەوە بێ: وێكهاتنەوە بە ژانەكانیماسوولكەكانی هۆی دەرونیان هەبوو، واتە ئەمە بە پێی ویستی خۆی روویدەدا. هۆیەكەم لێ پرسی. بە كورتی وڵامی دامەوە بە هۆی ئالۆزی دەرونی هەست بە نیگەرانی دەكا. پاشان ناراستەو خۆ پێی وتم شتێك ئازاری دەدا، منیش هەوڵم نەدا بزانم چ شتێك ئازاری دەدا چونكە دەمزانی لە ژانی زگ پڕی زیاتر چیتر نیە. پاشان لێم پرسی بە راستی منداڵەكەی گەرەكە و بۆم باس كرد بیر كردنەوە و خەیاڵ جار جارە دەبنە هۆی مەرگی كۆرپەلە: پێویست بوو هێدی هێدی بە سەر ئەم ئالۆزە دەرونیە دا زاڵ بێ. ئەو بە تووڕەویەوە وڵامی دامەوە ئەم داوا كردنە وەك ئەوە دەچێ لێمی بوێ رەنگی چاوەكانی بگۆڕێ. چەند رۆژ دواتر هاتەوە لام. گەرابۆوە دۆخی ژیانی جارانی بەڵام تەندروستی گەلێ خراپتر بوو بوو. لە نەخۆشخانە خەواندم. لەوێ هەشت رۆژ بە دەرمان هێدیم كردەوە و نەمهێشت بجوڵێ.**

**((هەنوكە، خوشكان و برایان، دەگەینە جنایەتەكە. بەڵام پێش لەوەی باسی بكەم دەڵێم: با دابنێین یەكێك لە ئێوە تووشی نەخۆشییەكی قورس بووە و پێویستی بە دەرمان هەیە، رزگاربوونتان پێوەندی هەیە بە وەی كەسێكی هەبێ ئەم دەرمانەتان بداتێ. ئەو كەسەی دەرمانەكە فرێ دەدا و دەیرێژێ و لەبری ژارتان بداتێ چ ناوێكی لێ دەنێن؟**

**شێت، خۆ بە زل زان، یان تاوانبار، بەوەی یارمەتی نەخۆشەكەی نەكردوە؟**

به رای من ئەو وشانە پڕ بە پێستی نین و پێناسەی ئەم هەڵوێستە ناکەن. بە رای من کەسێکی وا قاتڵە. بەرێزانی لێژنەی داد پەروەران شك لەوە دا نیە کۆرپەکە هەمان نەخۆشەکەیە، دەرمانەکەشی جیا لە پشوودان چیتر نەبووە. بەڵام ئەم ژنە نەك هەر دەرمانەکەی بە نەخۆشەکە نەدا بەڵکوو بە چوونی بۆ سەفەرەکە ژاری دەرخوارد دا: چەندین کاژێر فرین بە تەیارە و لێخورینی ماشێن ئەویش بە تەنیا و لەم رێگە ناخۆشە دا. من بە تکا و رجا کردن پێم وت ئەوەی لە زگت دایە تەنیا خانەیەکی دابەش بوو نیە بەڵکو منداڵێکە. ئاگادارم کردەوە کە لەوانەیە کۆرپەکەی بەم کارە بکوژێ. بەڵام بە تووڕەییەوە ولامی دامەوە و قسەکەی لێ وەر نەگرتم. هەر وەها کاغەزێکی ئیمزا کرد کە بەرپرسایەنی هەر جۆرە رووداوێك وە ئەستۆ دەگرێ.

سەفەرەکەی کرد. منداڵەکەی کوشت. دیارە ئەمە دەزانم ئەگەر لە بەر دەم دادگایەکی ئاسایی دابایـن، سەلماندنی تاوانەکەم، بۆ ئەستەم بوو. چونکە دەرمانی منداڵ لە باربردن یان نەشتەرگەری بە کار نەهێناوە. بە پێی یاسای باو ژنێکی لەم جۆرە بە بێ تاوان دادەنرێ، چونکە لە راستیدا تاوانێك رووی نەداوە. بەڵام بەرێزان ئەمە بزانن ئێمە ئەندامانی لێژنەی دادوەرانی ژیانین و، من بە ناوی ژیان پێتان رادەگەیەنم هەڵسوکەوتی ئەم ژنە خرابترە لە هەر جۆرە دەرمانی لە بار بردن یان نەشتەرگەری. هەڵسوکەوتی پەست و فێڵبازانە و بێ مەترسی سزادان. فرە هەوڵ دەدەم هێندێك بەڵگەی بۆ دابتاشم بۆ ئەوەی تاوانەکەی لە سەر سووکتر بێ و عەفوو بکرێ. بەڵام چۆن؟ ئێوە بڵێین، هەژار بوو و نەیدەتوانی بژیوی ژیانی دابین بکا؟ شتی وا نیە. بۆ خۆشی باش دەزانێ. یان لەوە دەترسا منداڵێکی ساغی ببێ و لە بەرامبەر کۆمەڵدا دیفاع لە خۆی بکا. هەرگیز: ئەو سەر بە دامەزراوەیەکی کولتوورییە، لە باتی ئەوە لە سەر کوشتنی منداڵێك دایبڕن، دەیکەنە قارەمان. ئەو بڕوای بە هیچ کام لە یاساکانی کۆمەڵ نیە. خودا، نیشتمان،بنەماڵە، ژیانی ژن و مێردایەتی و بە گشتی هەموو بنەماکانی ژیانی کۆمەڵایەتی بە هیچ دەزانێ. تاوانەکەی بە هۆی ئەو بەڵگانەی لە سەر ئازادی هێناونیەوە سووك ناکرێتەوە. ئازادی تاکەکەس، ئازادی سەرە رۆیی کە مافی کەسانیتر پێشێل دەکا. وشەی مافم بە کار برد بۆ ئەوەی ئێوە نەڵێن ئەو ژنە بە کوشتنی منداڵەکەی لە مافی خۆی کەڵکی وەر گرتوە: ئەو مافەی بە پێی ئەو دەتوانی نەهێڵی منداڵێکی نەخۆش و سەقەت لە دایك ببێ. ئەمە ئەرکی ئێمە نیە پێش ئەوەی منداڵ لە دایك ببێ بزانین سەقەتە یان نا. ((هۆمێر))⋆ کوێر بوو و ((لیوپاردی - یش))⋆⋆ پشت کووڕ. ئەگەر سپارتەکان لە سەر بەردەکانەوە هەڵیانداشتبان، ئەگەر دایکەکانیان لەوە ماندوو دەبوون لە زگی خۆیاندا هەڵیانگرن، ئەمرۆکە مرۆڤایەتی گەلی لاواز دەبوو: من ئەمە پەسەند ناکەم پاڵەوانێکی ئولەمپیك نرخی لە شاعیرێکی دەستەوەستان فرەتر بێ. سەبارەت بە نەپاراستنی کۆرپەڵەیەکی پاڵەوانی ئولەمپیك یان شاعیرێکی دەستەوەستان، ئەوەتان بیر دەخەمەوە مرۆ بتەوێ و نەتەوێ بەم جۆرە زاوزێ دەکا. من ئەم ژنە بە تاوانبار دادەنێم.!

بە دەنگی هاوارەکەی راچڵەکیم. چاوانم لە سەر یەك دانا و، نەمزانی خانمی دوکتور هەڵستاوە و نۆرەی قسە کردنیەتی. کە چاوم هەلێنان دەستی پێ کردبوو بە دەم قسە کردنەوە دەیگوت: هاوکارەکەم لە بیرلی کرد پێمان بڵێ لە بەرامبەر هۆمێرێك دا هیتلێرێکیش لە دایك دەبێ. هەر زگ پڕ بوونێك وەك داهێنانێکە لەوانەیە گەلێ بە سود و بە شکۆ بێ و لەوانەشە گەلێ ترسناك بێ. من نازانم ئەم منداڵە دەبوو بە ژاندارك یان هیتلێر، ئێستا کە ئەم منداڵە مردوە و ئێمە نازانین دەبوو بە چی. بەڵام بە پێچەوانەوە من دەمزانی ئەم ژنە کێیە: حەقیقەتێك کە دەبێ لە نێو ببرێ. بە رای من لە نێوان شتێکی نادیار و نەناسراو دا و حەقیقەتێك کە نابێ لە نێو ببرێ ئەمەی دووهەمیان هەڵدەبژێرم.

---

⋆ هۆمێر: Homeria قارەمانی کوێری یۆنانی کە ئەویان بە دانەری دوو حەماسەی بە ناوبانگی ئیلیاد و، ئۆدیسە داناوە. سەردەمی دانانی ئەم دوو سرودە بۆ ساڵانی 550 ی پێش زایین دەگەرێتەوە.

** جیاکومو لیۆپاردی Giacomo Leopardi شاعیری پشت کوری ئیتالیایی 1838 – 1798، له "کاناتی" له دایك بووه. له ساڵی 1827 چووه بۆلونی، پیزا، فلۆرنسا. باشترین بەرهەمی بەناوبانگی ((ئیپیریت مۆراڵی)) ئەو شیعرانەن پێشاندەری نائومێدی فەلسەفەی ئەوە.

پێدەچێ هەیبەتی ژیان هاوکارەکەمی تووشی دڵە خورپە کردوە. بەڵام ئەو ئەم هەیبەتە بە هی کەسێك دادەنێ کە دەیتوانی ببێ، نەك کەسێك ئێستا کە هەیە. گەورەیی ژیان تەنیا رستەیەکی رێکە و بەس، رستەی ((منداڵ ددانی خرابوو نیە)) تەنیا رستەیەکی جوان. گرێو دەکەم کاتێ هاوکارەکەم لە شەردا گوللەی داویشت و خەڵکی دەکوشت لە بیری کردبوو منداڵێکی تەمەن بیست ساڵیش ددانی خرابوو نیە. بەرای من شەر تاوانبارترین منداڵ کوژە. شەر واتە کوشتنی کۆمەڵەی تەمەن بیست ساڵەکان. نازانم هاورێکەم بە چ واتایەك شەری پێ بە هەیبەتە و بە گەورەی دادەنێ و لە هاورێك کردنی دەگەڵ تێزەکەی خۆی واتە بەردەوامی دەپارێزێ. لە روانگەی زانستیشەوە ناتوانین ئەم بەردەوامییە بە جیددی وەر بگرین: دەنا، هەر جارەی تۆوێك ناتوانی پیتێن بکا و دەمرێ، هەر جارەی دووسەد ملیۆن ئیسپیرماتۆزۆئید دەیانەوێ بخزێنە هێلکەدانەوە سەرکەوتوو نابن، دەبێ ماتەم بار بم. لەمەش خراپتر: ئەو کاتەی ئەم تۆوە پیتێن دەکا دەبێ بۆ نۆسەد و نۆ ملیۆن و نەوەدو نۆ هەزار و نۆسەدو نەوەدونۆ تۆوی ماوەی کە ئەم کردارەیان بۆ جێبەجێ نەکراوە ماتەم داگرم. ئەوانیش دروستکراوی خودان. ئەوانیش رووحیان لەبەرە و پڕن لە توخمەکانی پێك هێنەری ژیان. ئایا هاوکارەکەم قەت لە ژێر مایکرۆسکۆپەوە سەیری نەکردون؟ نەیدیون وەك گارانی بۆقان خۆداوێن و بۆ پێش دەچن؟ قەت نەیدیون کاتێ خۆ بە دیواری هێلکەدان دا دەدەن و توانایان نامێنێ و نائومێدانە سەر لە ئەولاو ئەولا دەدەن و دەزانن وەستان یانی مەرگ؟ دیمەنێکی جەرگ بڕە! هاوکارەکەم بە وەبەر چاو نەگرتنی ئەمانە ستەم لە رەگەزی خۆی دەکا. مەبەستم ئەوە نیە تانە و تەشەر باوێم، بەڵام ئێستەکە ئەو ئەوەندە باوەری بە ژیان هەیە چۆن ئیزن بە خۆی دەدا بێ هیچ هەوڵدانێك میلیارد و میلیارد ئیسپرماتۆزوئید بمرن؟ ئەمە فریا نەکەوتنی ئەو نەخۆشەیە لە گیان دان دایە یان بە ئاشکرا جنایەتە: جنایەت. کە واتە ئەویش دەبێ لەم قەفەسە دا بێ. ئەگەر نەچێتە قەفەسەکەوە مانای ئەوەیە درۆی کردوە کە دەیگوت خۆی خستۆتە داوی ئەو ئیحساساتەی کە دەڵێ کێشە لەوە دا نیە خەڵکی زۆرتر لە دایك دەبن، بەڵکو کێشەکە لەوە دایە بۆ ئەوانەی هەتا ئێستە لە دایك بوون ژیانێکی لە بارتر و گونجاوتر دەستە بەر بکەین.

((من قەت گەرەکم نییە هاوکارەکەم بە تاوانبار دابنێم. چ بگا بە تاوانی هەڵە لە قەزاوەت کردن دا تاوانبار بکرێم. هەروەها لێژنەیەکی دادوەرانی ژیانیش لە توانای دانیە هەڵە لە قەزاوەت کردن دا مەحکووم بکا. کە واتە مەسەلەکە ئەمە نەبوو: مەسەلە تەنیا قەزاوەت کردنێك بوو و لێشی پەشیمان نیم. زگ پڕی ئەو سزایە نیە سروشت بۆ ساتێکی خۆش دیاری کردبێ. بەڵکو موعجیزەیەکە دەبێ بە شێوەیەکی سروشتی، وەك دار و ماسییەکان بەرەو پێش بچێ. ئەگەر خولی ئەم زگ پڕیە سروشتی نەبێ، ناکرێ چاوەروانیت لە ژن هەبێت مانگەکان وەك کەم ئەندامان لە سەر جێگە بکەوێ بە واتایەکیتر ناکرێ بە ژن بڵێی واز لە چالاکیەکانی، لە کەسایەتی و لە سەر بەستی خۆی بێنێ. من ئەم پرسیارە دێنمە گۆرێ، لە پیاویش ویستراوە کە ئەویش بە رادەی ژن کە لەم ساتە خۆشە چێژی وەرگرتوە، ئەم کارە بکا؟ وا دیارە هاوکارەکەم ئەو حەقەی بۆ پیاوانی دادەنێ بۆ ژنانی دانانێ ـ مافی ئەوەی ژن خاوەنی لەشی خۆی بێ ـ بە رای وی پیاو مێش هەنگوینەیەکە دەتوانێ شیرەی گوڵەکان دانە بە دانە هەڵمژێ و ژنیش تەنیا ئامێرێکی زاو و زێیە. ئێمە گەلێ جار تووشی بابەتی ئاوا دەبین: دوکتوری نەخۆشی ژنان، ئەو ژنە نەخۆشانەیان لا پەسەندە کوڵ کێشی هێدی و لە سەر خۆن، ئەوانەی بۆیان گرنگ نیە سەربەست بن یان نا. لێرە دا مەبەست تاوانبار کردنی دوکتورەکان نیە. بەڵام ئێوە دەزانن لێرە کۆببووینەوە ژنێك کە بە قەتڵ تاوانبار کراوە، قەتڵ بە هۆی کەرەسە نا بەڵکو بە هۆی بیر، دادگایی بکەین. من تاوانبار کردنی ئەم ژنە بە بەڵگەی قایم رەد دەکەمەوە. ئەو رۆژەی تاقی کاریم ئەنجام دا، باری تەندروستی باش بوو و زۆر ئارام و لەسەرە خۆ بوو. بەڵام ئەو رۆژەی زانیم کۆرپەکە مردوە، ژانێکی بە هێز کە باسی لێ ناکرێ لە

رووخساری دا وەدەر کەوت. لە بری وشەی منداڵ لە وشەی کۆرپە کەڵکم وەر گرت: چونکە زانست ئەم ئیزنـەی بـە مـن داوە. کۆرپەڵە ناوی منداڵە بۆ ئەو کاتەی لە زگی دایکیدا دەژی؛ پاشان دوای نـۆ مـانگ و، هێنـدێ جاریش حـەوت مـانگ کە کۆرپەکە لە دایـك دەبـێ پێـی دەڵێن منـداڵ. با بڵێین دەتـوانین بـە کۆرپـەی ئـەم ژنـە بڵێین منـداڵ دوبـارە تاوانێك روینەداوە. هاوکاری بەرێز، ئەم ژنە حەزی نەکردوە منداڵەکەی خۆی بکوژێ: بە داخەوە لە زۆر بوار دا ژیـانی ئێمـە پـڕە لە بـە ئـاوات خواسـتنی مـەرگی یـەکتری. ئەگـەر کەسـێك هێرشمـان بکاتـە سـەر هێرشـی دەکەینـە سـەر. لـە نێـو قـانوونی میللەتان دا بە مە دەڵێن بەرگری قانوونی. ئەگەر ئەم ژنە لە دڵی خۆشی دا ویستبێتی منداڵەکە بکوژێ سـەرلەنوێ ئـەم کارەی لە حاڵەتی بەرگری قانوونی دا ئەنجام داوە. کە واتە ئەو تاوانبار نیە.))

پاشان باوکت هەڵستا. نەدەگریا. بەڵام هەر کە ویستی لێوەکانی بجوڵێنـێ هـەتا قسـە بکـا چـەنەگەی لـەرزی و سـەر لـە نـوێ فرمێسـك بـە سـەر گۆناکـانی دا هـەڵتکان. سـەر لـە نـوێ سـەری لـە نێـو دەسـتانی گرتـەوە و، لـە سـەر چـرپایەکە دانیشتەوە. دوکتور بە تووڕەییەوە پێـی وت: ((ناتانـەوێ قسـە بکـەن؟)) باوکـت بـە حـاڵ سـەری لەقانـد دەتگـوت دەیـەوێ وڵامی بەڵێ بداتەوە. دوکتور وتی: ((دەبێ رای خۆی دەربڕێ و ناتوانێ خۆی لێ ببـوێرێ.)) باوکـت لـە پرمـەی گریـانیدا. ((تکات لێ دەکەم قسەکانی خـۆت بکـە!)) باوکـت بـە بـێ ئـەوەی وڵامێـك بداتـەوە فنـەفنێکی لێ هـات. ((تاوانبـارە یـان بـێ تـاوان؟)) باوکـت هەناسـەیەکی قـوڵی هەڵکێشـا و، ورتەیـەکی لێ هـات: ((تاوانبـارە))، لـەو کاتـەدا شـتێکی سـەیر روویـدا: هاورێکـەم رووی تێکـرد و تفێکـی لـە دەم و چـاوی کـرد. کاتـێ باوکـت تفەکـەی دەسـتڕیەوە هاورێکـەم بەسـەریدا قیژانـد: ((ناپیاو! هیچ و پوچ! حەیوان! ئاخر هەر تۆ نەبووی تەلەفۆنت بۆ دەکرد و لێی دەپارایـەوە منداڵەکە لـە بـار بـەرێ؟ بـۆ هەر تۆ نـەبووی وەك عەسـکەری فـیرار دوو مـانگ لێـرەو لـەوێ خـۆت دەشـاردەوە؟ ئـەتۆ لـە سـەر داوای مـن نەچـووی بـۆ بینینی؟ ئەمە پیشەی تۆیە. دەترسی و ژنان بەرهەڵدا دەکەی و پاشان وەك باوك خۆت دەناسـێنی. بـاوك بـوون لای تـۆ چ مانایەکی هەیە؟ زگێکـی هەڵمسـاو و، ناشـیرن؟ ژان هـاتنی منـداڵ بـوون؟ رەنجـی شـیر دان؟ بەرهـەمی باوکایەتیشـتان وەك کراسێکی ئووتووکراو لە پێش دادەنێن. ئەگەر ژنتان هێنا تەنیا ئەرکێکی لـە سـەرتانە نـاو لـە منداڵانـە، تـازە لەمـەش را دەکـەن. هـەموو بەرپرسـایەتی دەرد و قسـە و قسـەڵۆکی خـەڵکیش بـۆ ژن بـن. ئەگـەر ژنێـك دەگـەڵتان رادەبـوێرێ وەك سـۆزانی و لـەش فـرۆش هـەڵس و کـەوتی دەگـەڵ دەکـەن. لـە هـیچ قاموسـێك وشـەی فاحیشـە بـەم مانایـەی ئێـوە لێکـی دەدەنـەوە وا لێـك نەدراوەتـەوە. چـەند هـەزار سـاڵە وشـە و، فـەرموودەکانتان بـە سـەر ئێمـەدا دەسـەپێنن. هـەزاران سـاڵە ئێمـەتان لـە بێـدەنگی و شـەرتەکانی دایکایـەتیدا زینـدانی کـردوە. ئێـوە لـە هـەر ژنێـك دا دایکێکـی دەدۆزنـەوە. لـە هـەر ژنێکی بگرە لە کچەکانتان چاوەڕوانیتان ئەوەیە ببێتە دایکتان. دەڵێن ئێمە توانا و هێزی باسك و بـازوی ئێوەمـان نیـە و، بەرهەمی توانایی ئێوە دەخۆین. وامان لێدەکەن پێڵاوەکانتان بۆ واکس بکەین دەڵێن مێشکمان کار ناکا، کـە چـی بـۆ هـەر چی شتە کەڵك لە هۆش زیرەکیمان وەر دەگرن. ئێوە بۆ سەر و سامان دانی باری ژیانتان بیری ئێمـە دەدزن. ئـەی منداڵە ئەبەدییەکان، هەتا ردێنیشتان سپی دەبێ، دەبێ نانتان بە دەمەوە بکەین. بتان شـۆرین و، وشـکتان بکەینـەوە، رێنوێنیتـان بکەین لە بەرامبەر نەخۆشی و پیریدا پارێزگاریتان لێ بکەین. لێتان بێزارین. لە خۆشم بێـزارم چـونکە نـاتوانم بـێ ئێـوە بژیم و هاوار دەکەم: ئێمە لە دایکایەتی ماندوو بووین. لەم وشەیە کە ئێوە لـە بـەر قـازانجی خۆتـان بـە پـیرۆزی دادەنـێن ماندوو بووین. ئاغای دوکتور دەبێ تف لە نێوچاوانی تۆش بکرێ. ئێوە پێتان وایە ژن رەحـم وهێلکەدانـە و مێشـکی نیـە، ئێوە کاتێ ژنێکـی زگ پـڕ دەبیـنن پێتـان وایـە: ((بـە کـەیفی خـۆی رایبـواردوە و پاشـان هاتۆتـە لاتـان بـۆ ئـەوەی چارەی بکەن.)) ئاغـای دوکتـور قـەت رادنـەبواردوە؟ گـەورەیی ژیانتـان لـە بـیر کـردوە؟ وەهـا بـەرگری لـە گـەورەیی ژیـان دەکـەن ئینسان پێی وایە ئەوەی خانمی هاوکارتان بە موعجیزەی لە دایك بوونی دادەنێ، ئێرەیی پێـوە دەبـەن. بـەڵام وا نیە،شـتی وا ناگونجێ! ئـەم موعجیزەیـە بـە رای ئێـوە فیداکارییـە. وەك پیاوێـك ناتانـەوێ بـەرەنگاری ببنـەوە. ئاغـای دوکتـور ئـەم

دادگایی کردنە تەنیا دادگایی ژنێك نیە، دادگایی کردنی هەموو ژنـانی دنیایـە. کـە واتـە مـافی خۆمـە ئەمـە بـاش بەرمـە نێو مێشکتانەوە: دایك بوون ئەرکێکی ئـەخلاقی نیـە. ئـەرکێکی بـایۆلۆژیش نیـە. هەڵبژاردنێکـە لـە رووی هوشـیارییەوە. ئەم ژنە لە رووی هۆشیارییەوە ئەمەی هەڵبـژاردوە و قـەت مەبەسـتی نـەبوو کـەس بکوژێ. دوکتـوری بـەرێز ئێـوە بـوون ویستتان ئەم ژنە والێبکەن بیر نەکاتەوە و بەم جۆرە چاڵی مەرگی بۆ هەڵکەنن. کەواتە ئەوە ئێـوەن دەبـێ بچنـە نێـو ئـەم قەفەسەوە. لەبەر ئەوە ناویستوتانە یارمەتی میلیارد میلیـارد ئیسـپێرماتۆزی نـەزان بکـەن، بـەڵکو بـە تـاوانی ژن کوشـتن. پاش ئەوەی گوێ بیستی راکانم بوون پێویست ناکا بڵێم تاوانبار کراو تاوانبار نیە.))

پاشـان بەرێوەبـەری ئیدارەکە وای پێشـان دەدا نارەحەتـە هەڵسـتا. نەیـدەزانی چـی بڵـێ. لـەم دادگـایی کردنـە خـۆی بەبێگانـە دادەنـا. ئەنـدامانیتری لێژنـەی دادوەران بـە هـۆی پیشـە و سـۆزیانەوە پێوەنـدیان بـە تاوانبـارەوە هـەبوو کـە منداڵەکەش رۆڵی تێدا دەگێرا. بەڵام ئەو تەنیا بەرێوەبەری تاوانبار کراوەکە بوو. هەتا ئەو جێگەیـەی پێوەنـدی بـەوە وە هەبوو ئەم دۆخەی هاتبووە پێش پێی ناخۆش نەبوو. وەك بەرێوە بەرێك ئـەم دۆخـەی بـە رێگـر و بگـرە رووداوێکـی دڵ تەزێن دەزانی کە بۆی بە گران تەواو دەبوو. ئەمەش چونکە تەنیا بیری لەو مەعاشە دەکردەوە کە بە پێـی یاسایەکی بـێ مانا ناچار بوو لە ماوەی پشوودان دەبوو بیدا بە کارمەندەکەی خـۆی. بـە رای وی منداڵەکـە زۆر لـە دایکـی ژیرتـر بـوو و بـە مردنـی هـەموو کێشـەکانی تـەواو کـرد بـوون. کاتـێ خـەڵك فەرمانبـەرە بـێ مێردەکـەیان دەدی منـداڵی لـە ئامێزدایـە چییان بەو نەدەگوت؟ بێ دوودڵیو بە راشکاوی وتـی: ئەگـەر ژنـە هێشـتبای ئـەو هـەر زوو لـە شـەڕ و هـەڵای ئـەو منداڵـە رزگاری دەکرد. سەرە رای ئەمانە، ئەو تەنیا بەرێوەبەرێك نەبوو، ئینسانیش بـوو. دوو پیـاوی لێژنـەی دادوەران کـە پـێش لـەوەوە قسـەیان کردبـوو، ویـژدانیان بـە خەبـەر هێنـابوو. دوکتـور بـەم هـزرە و ئەخلاقیـەوە و، بـاوکی منداڵەکـەش بـە پەشێوییەکەی. لە ئاکام دا ئەو نەیدەتوانی لە هزری یەکەمدانە و غەمی دووهـەمیان دا شـەریك نـەبێ. منـداڵ هـی دایـك و باوك، هەر دووانیـەتی: ئەگـەر جنایـەتێك روویـدابێ، جنایـەت دووپـات کراوەیـە چـونکە لـە لایەکـەوە ژیـانی منـداڵێکی کوژاندۆتەوە و لـە لایـەکیترەوە ژیـانی ئینسـانێکی گـەورەتری تووشـی نسکۆ هێنـاوە. کەواتـە لـە پێشـدا دەبـێ بسـەلمێنین تاوانێك رووی داوە یان نا. بەڵام داخۆ چکۆلەترین دڵەخورپە لە مەر ئەم بابەتەوە لە گۆڕێ دایە؟ ئایا بەڵگـەی قـایمتر لـە بەڵگـەکانی دوکتـور پێویسـتە؟ دوکتـور کـە باسـی خـۆ پـێ زلی و لـە خـۆ بـایی بـوونی کـردو دەلاقەیـەکی بـۆ عـەفوو نەهێشتەوە. بەرێوەبەری بەرێز، دەبوو بەرەی لە سەر حـەز و هانـدەری مـن لابردبـا. تاوانبـار کـراو لـەوە دەترسـا نـەوەك سـەفەرە گرنگەکـە سـپێردرابا بـە کەسـێکیتر هـەر بۆیـە لـە جێگـە هاتـە دەر بـێ وەبـەر چـاو گرتنـی کۆرپەکـەی و، بـێ بەزەییانە ئەم کارەی کرد. هاورێیەکەم بۆی هەبوو تفی لێ بکا. هەر وەها دەتوانێ بێعەدالەتیـەکان مـەحکووم بکـا. بـەڵام هەر تاوانبار کراو تاوانبارە.

لەم کاتەدا بوو نیگام بە دوای دایك و باوکم دا دەگەڕا. بە زمانی بێ زمانی لێیان دەپارامەوە چـونکە ئـەم دووانـەم بـە دوایین هەلی رزگار بوونی خۆم دادەنا. بـە نیگایـەکی نائومێدانـەوە وەڵامیـان دامـەوە. زۆر مانـدووتر و پیرتـر لـە سـەرەتای دادگایی کردنەکە دیار بوون. سـەریان قورسـایی لـە سـەر جەسـتەیان دکـرد و، وا هەڵدەلـەرزین دەتگـوت سـەرمایانە. هـەر واهـا ئـەم غەمـە و نیگەرانییـەی لـە خەڵکەکـەیتر جیـای دەکردنـەوە تووشـی شـکانی کردبـوون و هـەردووکیان لـە نائومێدیـەك دا شـەریك بـوون. دەسـتیان لـە نێـو دەسـتی یـەکتری نـابوو ئیزنیـان وەرگـرت بـە دانیشـتنەوە قسـە بکـەن. داواکارییەکەیان جێ بـە جـێ بـوو. تێیانـەوە رامـابووم بـە گـوێی یـەکتریان دادەچـرپاند و رایـان دەگۆڕییـەوە کامـەیان لـە سەرەتادا قسە بکا. لە سەرەتادا باوکم قسەی کرد. ئـەو وتـی: ((سـەبارەت بـەم پێشـهاتە دوو کـەرەت تووشـی ئـازار و رەنـج بووم. یەکەم جار کە زانیم منداڵەکە هەیە و پاشان کە ئاگاداری مەرگی بـووم. هیـوام وایـە ئـازاری سـێهەمی نەیەتـە سـەر رێم: ئازاری مەحکووم کرانی کچەکەم. نـازانم ئـەم شـتانە چۆن روویانـدا، هـەر وەهـا هـیچ کـام لـە ئێـوەش ئەمـە نـازانن.

چونکە کەس ئاگای لە دەروونی کەسیتر نیە. هەر چۆنێکی بێ ئەو کچی منە و وەك باوکێك منداڵەکان تاوانبار نین.))
هەر بە دوای ئەو دا دایکم قسەی کرد. ((ئەو کچە بچکۆلەکەی منە و، هەمیشەش کچە بچکۆلەکەی من دەمێنێتەوە.
کچە بچکۆلەکەم قەت کاری خراپ ناکا. کاتێ پێی راگەیاندم زگی هەیە لە وڵامی دا بۆم نووسیەوە: هەر بریارێکی
بۆخۆت بیدەی راستە. ئەگەر بیوتبا منداڵەکەم گەرەك نیە هەر ئەم وڵامەم دەدایەوە. قسە کردن لە سەر ئەم شتە
پێوەندی نە بە منەوە هەیە نە بە ئێوە. ئێوە حەقی ئەوەتان نیە کەس تاوانبار بکەن و، هەروەها حەقی ئەوەشتان نیە
دیفاعی لێ بکەن چونکە لە دڵ و دەروونی ئەودا نین. هیچ کام لە شاهیدییەکانی ئێوە نرخی نیە. هیچ شاهیدێك
ناتوانێ پێمان بڵێ چی روویداوە. تەنیا شاهید منداڵەکەیە کە ئەویش ناتوانێ...)).

لەم کاتەدا بوو لێژنەکە قسەیان بە دایکم بری و هاواریان کرد منداڵەکە ((منداڵەکە! منداڵەکە!)) توند توند
میلەکانی قەفەسەکەم گرتبوو و، هاوارم کرد: ((منداڵەکە نابێ!)) و هەروا کە هاوارم دەکرد...

*** *** ***

بەڵێ، بە دەم هاوار کردنەوە گوێم لە دەنگی تۆ بوو: "دایکە!" هەستم بە لاوازی کرد. چونکە یەکەمین
کەڕەت بوو گوێم لێ بێ یەکێك بانگی دەکردم دایە؛ چونکە یەکەمین کەڕەت بوو گوێم لە دەنگی تۆ دەبوو؛ چونکە ئەم
دەنگە دەنگی منداڵ نەبوو. دەنگی مرۆڤێکی پێگەیشتوو، دەنگی پیاوێك. بیرم کردەوە: "پیاوێك بوو" پاشان لە بیری
خۆم دا وتم: "پیاو بوو، تاوانبارم دەکا." دواجار بیرم کردەوە: "حەز دەکەم ببیینم! "چاوەکانم لە هەموو شوێنێك دا
بە دوات دا دەگەڕان. لە نێو قەفەسەکەدا، لە دەوری قەفەسەکە، لە سەر چرپاکان لە سەر عەرز، لە سەر دیوارەکان،
بەڵام تۆیان نەدۆزیەوە. ئەتۆ لەوێ نەبووی. جیا لە بێدنگیی گۆر ئاسا دەنگێکی تر نەدەبیسرا و لەم بێدەنگیە رەهایە
دا سەرلەنوێ دەنگت هاتەوە: "دایکە! لێم گەڕێ قسان بکەم. مەترسە، مرۆڤ نابێ لە راستییەکان بترسێ. ئەم راستیەی
کە لێرە باس کراوە دووبارەیان کردۆتەوە. هەر کام لەمانە باسی حەقیقەتیان کردوە. تۆ ئەمە باش دەزانی: خۆت فێرت
کردم حەقیقەت تێکەڵێك لە راستیە جیاوازەکانە. ئەوانەی بە تاوانبارت دادەنێن وەك ئەوانەی بەرگریت لێ دەکەن
حەقی خۆیانە. بەڵام قەزاوەتی وان گرینگ نیە. دایك و باوکت راست دەڵێن کەس ناتوانێ بچێتە دەروونی کەسەوە، من
شاهیدی بۆ ئەوە دەدەم. دایکە تەنیا منم دەتوانم بڵێم بە بێ ئەوەی بم کوژی کوشتمت. تەنیا منم دەتوانم بڵێم چۆن و
لە مەڕ چی ئەم کارەت کرد. دایکە نەم دەویست لە دایك ببم. کەس ئەمەی ناوێ. ئەم کۆتاییە، لە نەبوون، هیچ کەس
نایەوێ لە دایك ببێ. هەڵبژاردنێکیش لە ئارا دا نیە. جیا لە نەبوون هیچ شتێك وجوودی نیە. کاتێ جوولان دەست پێ
دەکا و، ئێمەش لێی بە ئاگا دەبینەوە، ئەم پرسە لە خۆمان ناکەین کێ ئەم بڕیارەی داوە و، ناپرسین راستە یان چەوت.
تەنیا پەسەندی دەکەین و چاوەروانی دەبین هەتا بەدیار بکەوێ لە پەسەند کردنی رازین یان نا. من هەر زوو
تێگەیشتم رازیم. ئەتۆش سەرەڕای هەموو ترس و دڵە خورپەکانت، باش توانیت قانعم بکەی لە دایك بوون جوانە و
هەروەها سەرچاوە گرتن لە نەبوونەوە جوانە. پێت وتم کاتێ لە دایك بووی نابێ ئازار و مەرگ بێ هیوات بکەن. کاتێ
یەکێك دەمرێ واتە لە دایك بووە چونکە لە نەبوونەوە هاتوە و، هیچ شتێك خراپتر لە نەبوون نیە: خراپترین شت
ئەوەیە کەسێك ناچار بێ بڵێ هەرگیز نەبووە. لە خۆبایی بوون و دڵنیا بوونت رێگەی لێ هەڵە کردم. لەخۆبایی بوونت
وەك گەورەیی و هەیبەتی ئەو سەردەمە دوورانە بووکە ژیان بەو جۆرەی بۆت باس کردم پشکووت. بڕوام بە قسەکانت
دێنا. دایکە دەگەڵ ئەو شلەیەی تێی دا بووم هەموو بیرەکانتم دەخواردەوە. هەر بیرێکت پەیامێك بوو بۆ من. لەمە
زیاتر چیتر دەیتوانی ببێ؟ جەستەی من وەهمێك بوو کە لە لایەن بەرەکەتی تۆوە گەشەی دەکرد؛ رووحی من
بەڵێنییەك بوو کە لە لایەن تۆوە و بەرەکەتی بوونت بەرگی راستی بەبەردا دەکرا. ئەوەی پێت دەوتم فێری دەبووم و،

ئەوەی پێت نەدەوتم لێێ بێ ئاگا دەمامەوە: سەرچاوەی رووناکی و ویژدانی من تۆ بووی. کاتێ بۆ ئەوەی من بێنیە سەر دنیا بەرەنگاری هەموو کێشەیەك دەبوویتەوە، پێم وابوو ژیان مەوهیبەتێکی بێ وێنەیە.

"بەڵام پاشان شك و گومانی تۆ زیادی کرد. جار جار پێت هەڵدەگوتم، جارجاریش هەرەشەت دەکرد. جاری وابوو دڵسۆزی و خۆشەویستیت نیشان دەدا جارجاریش رق. جار هەبوو بوێر بووی جار هەبوو دەترسای. رۆژێکیان بۆ ئەوەی لە شەری ترس رزگار ببی بڕیاری هاتنە سەر دنیات بە خۆم سپارد. پێت وتم فەرمانی منت جێبەجێ کردوە و مەیل و ویستی خۆت وەبەرچاو نەگرتوە. بەوە تاوانبارت کردم کە من ئاغای تۆم و تۆش قوربانیی منی، نەوەك من قوربانیی تۆ بم. پرتە و بۆڵەت لە سەر کردم چونکە ئازارم دەدای. بگرە شەڕت لە گەڵ منیش دەکرد و دەتگوت ئەمە ژیانە: داوێکی بەتاڵ لە ئازادی، بەختەوەری و، ئەوین. چاڵێکی پڕ لە دیلی و توندوتیژییە، قەت ناتوانم خۆی لێ رزگار بکەم. قەت ئیزنت بە خۆت نەدەدا پێم بڵێی لەم کونە مێروەدا رێگای رزگاری نیە و، کەس ناتوانێ لە یاسا رەشەکانی خۆی قوتار بکا. گوڵەکانی ماگنولیا تەنیا بە کەڵکی ئەوە دەهاتن ژنانی بەسەر دادەی و بیان کوژی. شکولات کەسانێك دەیخۆن کە پێویستیان پێنیە. داهاتوو ئەو پیاوەیە بۆ پەلکە نانێك و کیسەیەکی پڕ لە ژێر شلواری پیس دەکوژدرێ. چیرۆکەکانت بە پرسیارێکی دیاریکراو کۆتاییان دەهات. "ئایا بە راستی پێویستە هێلانەی ئارام و ئەمینت جێ بێڵی و بێیە سەر ئەم دنیایە؟" قەت پێت نەگوتم دەتوانم شکۆلات بخۆم بێ ئەوەی سووکایەتیم پێبکرێ، بەیانی دەتوانێ باشتر بێ لە دوێنێ. کاتێ هاتیتەوە سەرخۆ گەلێ درەنگ بوو بوو؛ من خۆم کوشتبوو، مەگری، دایکە: دەزانم ئەم کارانەی بەرامبەر بە من دەتکردن لە خۆشەویستیان بوون و، پێت خۆش بوو ئەو رۆژەی دەکەوتمە بەرامبەر وەحشەتی "لەدایك بوون"پەشیمان نەبمەوە. ئەوە کە، پێت دەڵێن ئیمانت بە ئەوین نیە درۆیە. دایکە ئەتۆ لەو کاتەوە لە دایك بووی بڕوات بە ئەوین هەیە، چونکە فرە کەمی دەبینی، چونکە ئەو خۆشەویستییەی بەدی دەکەی بێ کەم و کوڕی نیە. ئەتۆ لە ئەوین دروست کراوی. بەڵام کاتێ بڕوامان بە ژیان نیە بە تەنیا بڕوا بە ئەوین بەسە؟ هەر کە زانیم بڕوات بە ژیان نیە و، زۆری لە خۆت دەکەی بۆ ئەوەی بژی هەتا منت ببێ یەکەمین و دواهەمین بڕیاری خۆم دا: چاوپۆشیم لە لە دایك بوون کرد و بۆ دووهەمین جار لە بوونی مانگ بێبەریم کردی. ئەو کاتە هێزی ئەوەم هەبوو ئەم بڕیارە بدەم. بیری من چیتر بیری تۆ نەبوو. بیری خۆم بوو. بێ شك بیری من چکۆلە و خاو بوو، بەڵام ئەو توانایەی تێدا هەبوو بگاتە ئەو ئاکامەی ئەگەر ژیان ئەشکەنجەیە ئەدی بۆ پەسندی بکەین. دایکە قەت پێت نەگوتم بۆچی لە دایك دەبین. ئەتۆ دڵسۆزتر لەوە بووی بەو چیرۆکانەی بۆ دڵدانەوەی خۆت دەتگوتن من بە لاڕێدا نەبەی. تەنیا روونکردنەوەیەکی کە هەت بوو ئەوە بوو بۆ خۆشت لە دایك بوو بووی و پێش لە خۆشت دایکت و دایکی دایکیشت هەتا دوایی. ئەو بەردەوامیە هەروا بۆ دواوە دەگەڕێتەوە هەتاکوو هیچ شوێنێکی نامێنێ. لەم دابەش بوونە کە جیا لە خۆی کۆتاییەکی تری نیە، ئێمە لە دایك دەبین چونکە خەڵکیتر لە دایك دەبن و بوون. شەوێکیان بە منت گوت: ئەگەر ئاوا نەبا رەگەزی مرۆڤ دەبڕایەوە. بەڵام دایکە، بۆ ناچارە هەبێ؟ بۆچی دەبێ هەبێ؟ ئامانج لە بوون چیە؟ دەگەڵ تۆمە دایکە: ئامانج لە بوون، چاوەروانی بۆ مەرگ و نەبوونە. لە دنیای من دا کە تۆ پێی دەڵێی هێلکەدان ئامانجێك هەیە ئەویش لە دایك بوونە. بەڵام لە دنیای تۆ دا ئامانجێك جیا لە مەرگ بەدی ناکرێ؛ ژیان واتە مەحکووم بوون بە مەرگ. نەم دەزانی بۆچی دەبوو لە نەبوونەوە بچمەدەر بۆ ئەوەی بگەرێمەوە بۆ نەبوون.

ئێستا تێدەگەم سەبارەت بە تۆ و بەخۆم چەندە خراپەم هەبووە. هەروەها خراپەم بۆ هەموو ئەو شتانە هەبووە کە هەوڵم دەدا بڕوایان پێ بێنم: لە دایك بوون بۆ بەختەوەری، ئازاد بوون، باش بوون، شەڕ کردن بۆ بەختەوەری، داهێنان بۆ نەمردن، بۆ رزگار بوون لەم ترس و خۆفە، هیوادار بووم بریا هەموو شتێك خەون و مۆتەکە بوا، هەتا ئەو کاتەی لە دەستیان رزگارمان دەبوو بە زیندوویی بت بینم. لە جەستەما هەموو شتێك سەرلەنوێ دەست پێ بکاتەوە،

بێ ئەوەی ترسم هەبێ. بێ ئەوەی ئارام و سەبرم لەدەست بدەم، بێ ئەوەی لە بڕوایەك كە ناوی هیوایە چاوپۆشی بكەم و قەفەسەكەم رادەتڵەكاند لە بەر خۆمەوە دەمگوت قەفەسێك لە گۆڕێ دا نیە. بەڵام قەفەس هەبوو، بە راستی قەفەس بوو، بە راستی جێكای تاوانباران بوو، بە راستی دادگایی كردنێك لە گۆڕێ دا بوو. دادگایییەك ئەتۆ منت بە تاوانبار زانی، محاكمەیەك كە بۆخۆت لەوێ منت تاوانبار كرد، چونكە من خۆم تاوانبار كردبوو. ئێستا دەبوو سزاكەم دیاری بكرێ ئەویش بە تەواوی ئاشكرا بوو: دەست بەردان لە ژیان و گەڕانەوە بەرەو نەبوون دەگەڵ تۆ. دەستەكانم بۆ درێژ كردی. لێت پارامەوە منیش دەگەڵ خۆت بەری، ئەتۆ لێم هاتیە پێش وتت: "دایكە من دەتبوورم. مەگری، جارێكیتر لە دایك دەبم."

ئای لەو وشە شكۆدارانە، بچكۆلە، بەڵام داخەكەم تەنیا وشەن و كرداریان نیە. ئەگەر هەموو ئیسپرماتۆزوئیدەكانی دنیا دەست لە نێو دەستی یەكتری نێن تۆیان بۆ دروست نابێتەوە. ئەتۆ ئەو شتەی كە هەبووی و دەتتوانی هەبی. ئەتۆ قەت دووبارە نابیتەوە، بەڵام من لە نائومێدییەكی حاشا هەڵنەگر دا قسەكانم دەگەڵ تۆ دا درێژە پێ دەدەم.

*** *** ***

چەند رۆژ تێپەریوە و ئەتۆ لەوێ زیندانی بێ ئەوەی هەناسەی ژیانت تێدابێ. خانمی دوكتور لەم بابەتە نیگەرانە و سەری سووڕماوە. دەڵێ ئەگەر دەرت نەهێنێ لەوانەیە بمرم. باش لە مەبەستی دەگەم و لە وڵامی دا دەڵێم: هەرگیز بە تەما نیم بەم رادەیە خۆم سزا بدەم و تۆ بكەمە ئامرازی ئەو سزایەی بۆخۆم لە دادگایی كردنەكە دا دیاریم كرد. هەر ئەم ماوە درێژەی پەشیمان بوونەوەم لێ زیادە. لەم دۆخە دا ناوێرم لە دەرهێنانت پەلە بكەم هەر وەك تێناگەم بۆچی هەستێكی وام هەیە. لەوانەیە لەبەر ئەوەبێ خەو و خۆراك و نەخۆشیمان پێكەوە بووە و، خوومان پێك گرتوە. ئەمن دەگەڵ تۆ تەنیا بووم بێ ئەوەی هەست بە تەنیایی بكەم؟ لەوانەیە بەم خەیاڵە پووچەوە كە هەڵەیەكە و رووی داوە باشتر وایە ئێستاش هەر سەبر بكەم؟ لەوانەیە حەز نەكەم بگەڕێمەوە دۆخی جاران پێش ئەوەی تۆم هەبێ. چەندە حەزم دەكرد دووبارە ببمەوە خاوەن چارەنووسی جارانم و ئێستا كە بوومەوە خاوەنی ئەم چارەنووسە، بۆم گرنگ نیە.

ئەمەش راستییەكە لە راستییە بێئەژمارەكان كە ئەتۆ شانسی تێگەیشتن لێیانت نەماوە: لە چاوەنواری ئاگری سەروەت و ئەوین و ئازادی دا دەسووتێی و دەبیە خۆڵەمێش، لە هەوڵ و تێكۆشان بۆ وەدەست هێنانی ماف هیلاك دەبی و كاتێ پێی گەیشتی ئیتر چێژێكی بۆت نامێنێ. لە ئاكام دا لە دەستی دەدەی، گوێی پێ نادەی و، حەز دەكەی بۆ دواوە بگەڕێتەوە و بزاڤ ئازارەكان سەر لە نوێ دەست پێبكەیتەوە. كاتێ دەگەیتە هیواكانت هەست دەكەی ونت كردوون. خۆزگە بەوانەی دەڵێن: "دەمەوێ وەرێ بكەوم و، نامەوێ بگەمە هیچ شوێنێك." و خۆزگە بەوانەش نەبێ بەسەر خۆیان دا دەسەپێنن، دەمەوێ بگەمە جێ. گەیشتن واتە مردن، و لە نێو رێگەدا تەنیا جار جارە پشوو دەدەی ، خۆزگە دەمتوانی قەناعەت بە خۆ بێنم ئەتۆ تەنیا هەڵوێستەیەك بووی. بە مەرگی تەنیا كەسێك ژیان ناوەستێ. ژیان پێویستی بە تۆ نەبووە. ئەم دەرد و ئازارە بە كەڵكی شتێك یان كەسێك هاتوە. بەڵام ئەو منداڵەی دەمرێ و، ئەو دایكە حاشا لە دایكایەتی دەكا بە كەڵكی چی دێن؟ بە كەڵكی ئەخلاقییەكان، مەزهەبییەكان یان شۆڕشگێڕەكان؟

بەم پێیە دەبێ بپرسین كامە لەمانە قازانج لەم سەربردەیە دەبا و دەنگی دادگایەك كە كەسانێكی وا پێكیان هێناوە چ دەبێ. ئایا من شایانی ئەوەم ببەخشرێم یان سزا بدرێم لەلایەن ئەوانەوە؟ ئایا قازانجم بۆ ئەخلاقیەكان، لایەنگرانی ماف، مەزهەبییەكان و شۆڕشگێڕەكان هەبووە. ئایا گوناهی من ئەوە بووە بوومە هۆی كوشتنی تۆ و جەرگی خۆم یان ئەوەی كە رووحێكم بە تۆ دا كە ئەتۆ ئەو رووحەت نەبوو؟ گوێ رابگرە چلۆن مشت و مڕ دەكەن و هاواریان دێ: ئەم ژنە تەوهینی بە خودا كردوە، نا، سووكایەتی بە ژنان كردوە؛ ئەو لەبەر كێشەكان رای كردوە. ئەو خۆی تووشی كێشە كردوە؛ زانیویەتی ژیان پیرۆزە، زانیویەتی ژیان بێ واتایە. خۆزگە نەهێنیی بوون و نەبوون بەم رستەیە یان ئەو

یاسایه جێبەجێ دەبوو و خۆزگە هەر کەسە بۆخۆی ڕێگەیەکی جیاوازی نەدەدۆزیەوە. سەد خۆزگە دۆزینەوەی حەقیقەتێك، حەقیقەتێکی دژی بەرهەم نەدەهێنا و خۆزیا هەر دوو حەقیقەتەکە ڕاست نەدەبوون. ئامانجیان لەم کێشە و دەمە تەقانە چیە؟ دەیانەوێ دیاری بکەن عەداڵەت لە کوێیە؟ بچکۆلە حەق بە تۆ بوو. حەقیقەت لە هەموو شوێنێکە. لە هەر ویژدانێك لە ویژدانە بێ ئەژمارەکان پێك هاتوە: من هەمان دوکتور، خانم دوکتور و هاورێکەم و بەردەستی دوکتور و باوك و دایك و باوکتم. من هەمان ئەو شتەم هەر یەکە لە ئێوە بە منی گوتوە.

*** *** ***

باوکت نامەی بۆ نووسیومەوە. ئەم نامەیە هاتم دەدا بیر بکەمەوە. دەنووسێ: "من باش تۆ دەناسم و نامەوێ دڵداریت بدەمەوە باشت کرد منداڵەکەت کردە فیدای خۆت و خۆت فیدای منداڵەکە نەکرد. ئەتۆ لە من باشتر دەزانی (ئەتۆ بووی بەسەر منت دا ڤیژاند) ژن مریشك نیە و، هەموو مریشکەکانیش لە سەر هێلکەکانیان ناکەونو هێندێك لە هێلکەکان دەشکێن و دەیانخۆنەوە. ئێمەش تاوانباریان ناکەین. هەر وەك چۆن سروشت تاوانبار ناکەین. سروشت کە بە نەخۆشی و بوومەلەرزەکانی ئینسانەکان دەکوژێ. ئەوەندە چاك دەتناسم قەت بیرت ناهێنمەوە کە بێرەحمی سروشت و، هێندێك لە مریشکەکان ژیری و حیکمەتێکی تێدایە. ئەگەر هەر ئیمکانی دروست بوونێك دروست دەبوو، بستە خاکێك نەدەما لە سەری بژین. ئەتۆ گەلێ لە من خاستر دەزانی هیچ مرۆڤێك "زەرووری" نیە. دنیاش بێ بوونی هۆمێر و ئیکار و لیۆناردۆ داوینچی و حەزرەتی مەسیحیش درێژەی دەبوو. ئەو منداڵەی تۆ ویستت لە دەستی بدەی تۆزقاڵێکیش بۆشایی پێك ناهێنێ. نەبوونی نە زیان بە کۆمەڵ دەگەیەنێ نە بە دوارۆژ. تەنیا ئەتۆ غەمبار دەکا. چونکە لە بیر و هۆشت دا شانۆیەکی گەورەی خوڵقاندوە کە ئەم شانۆیە لەوانەیە هەر نەش بێ. خۆشەویستە بێچارەکەم: ئێستا تێگەیشتووی بیر کردنەوە یانی ئازار کێشان، هوشیاری یانی چارەڕەشی. بە داخەوە سێیەمین خاڵی سەرەکیت لەبیر کردوە: دەرد و ئازار تامی ژیانە و بێ ئەو ئێمە ئینسان نین. ئەم نامەیە لە مەڕ دڵدانەوەی تۆ دەنووسم. لەبەر ئەوەی شاد بی و دەمەوێ شوکری خودا بکەم ئەتۆ براوە بووی. نەك لە بەر ئەوەی لە زگ پڕی و منداڵ بوون ڕزگاریت بووە، چونکە سەرکەوتوو بووی تەسلیمی ویستی خەڵك و خوداش نەبی. ڕاست بە پێچەوانەی ئەوەی سەبارەت بە من ڕوویداوە: بەڵێ ئێرەییم بەو کەسانە دەبرد بڕوایان بە یەزدان هەبوو هەر بۆیە منیش تەسلیم بووم. سەرەرای چارەڕەشی شوکری خودای دەکەم. خودا هێمای سەرسووڕمانێکە کە بە ناوی ئەو هەموو لێك دابڕانەکان پێکەوە دەلکێننەوە: کاتێ یەکێك بڕوای بە خودا هەیە واتە ماندوو بووە. ئیتر ناتوانێ سەربەخۆ بەرەوپێش بڕوا. ئەتۆ ماندوو نی چونکە خودای شك و گومانی. خودا بۆ تۆ هێمای پرسیارە. یەکەمین هێمای پرسیار لە هەزاران هێمای پرسیاری تر. تەنیا ئەو کەسانە پێشکەوتن بە خۆیانەوە دەبینن کە پرسیار بۆخۆیان دادەنێن، ئەو کەسانەی مل کەچی ئەوە نابن تەنیا ئیمان بە خودا بێنن خۆیان بە قەزا و قەدەر بسپێرن، وەك مسافیرانی کەشتییەکی تێك شکاو خۆیان بە بەلەمێکەوە هەڵدەواسن بۆ ئەوەی پشوو بدەن و، سەرلەنوێ دەست پێ دەکەنەوە. بۆ ئەوەی سەر لە نوێ قسەی دژ بەیەك بکەنەوە، بچنە ژێر قسەکانیان و سەرلەنوێ تووشی دەرد و ژان ببنەوە. دۆستەکەمان دەڵێ منداڵەکە هێشتا لە زگ دایە و ئەتۆ ئێستاش ئامادە نی دەری بێنی، دەڵێ دەتەوێ بەم کارەت هەڵەکانت قەرەبوو بکەیەوە و، ژیان لە خۆت حەرام بکەی. بە ڕای من بۆیە ئەم هەواڵەی بۆ ناردووم هەتا تکات لێ بکەم واز لەم شێت بازاریەت بێنی. منیش لە بری ئەوە داوات لێبکەم واز لەم شێتەتیەت بێنی، پێت دەڵێم ئەتۆ زۆر زوو واز لەم شێتەتیە دێنی. ئەتۆ ژیانت گەلێ پێخۆشە و، ناتوانی گوێی بۆ بانگەوازەکەی ڕانەگری. هەر کە گوێت لەو بانگەوازە بوو وەك سەگەکەی جەك لەندەن کە بە نوزە نوزەوە دوای گورگەکان دەکەوت و، پاشانیش بوو بە گورگ گوێ ڕاهێڵی دەبی. کەواتە ئێمە سبەی دەگەڕێینەوە

**ماڵێ. پێدەچێ وشەی سبەی سووکایەتی کردنە بەتۆ بۆ منیش هەرەشە کردن. ناتوانم چاو بە چوار دەورمانە گێرم و هەست نەکەم کە سبەی پڕ نیە لە رووداوی جۆرا و جۆر.**

***** *** *****

**بەروو خۆشی و گەرمیەکی زۆرەوە پێشوازیان لێ کردم. دەتگوت پاش نەخۆشی لە جێگە هاتومە دەر و، ئێستا لە خولی چاك بوونەوە دابووم. لە مەڕ ئەو کارەی کە ((سەرەرای هەموو تەنگ و چەڵەمە و کێشەکانی لە ئەنجامدانیدا سەرکەوتنم بە دەست هێنابوو.)) پیرۆزباییان لێ دەکردم. بۆ شەو بانگهێشتنیان دەکردم. باسی تۆش لە گۆرێ دا نەبوو. کاتێ ویستم سەبارەت بە تۆ بدوێم. ((دەتگوت دەرگای بابەتێکی ناخۆشم کربۆوە، هەموویان چرو چاویان تێکنا و تێیان گەیاندم چیتر بیری لێ نەکەمەوە و، شتێکە و روویداوە.)) پاشان هاورێکەم بردمیە سوچێك بە لەحنێك دەتگوت دەیەوێ قەراری چاو پێکەوتنێکی گەورەم دەگەڵ دابنێ، پێی وتم سەبارەت بە من دەگەڵ دوکتور قسەی کردوە و، دوکتور وتوویەتی کۆرپەکە بۆ خۆی نایەتە خوارێ؛ ئەگەر کۆرپەکەی دەرنەهێنم تووشی چڵك و خوێن دەبم ئەمەش دەمکوژێ. دەبوو بە پەلە بریاری خۆم بدەم. سەیر دەبێ ئەگەر بۆ دروست کردنی هاوسەنگی ئەتۆ حوکمی ئیعدامم بەرێوەبەری. زۆر شت هەن دەبێ بیانکەم. تۆ ئەم کارانەت قەت دەست پێ نەکرد، ئەدی من بۆ دەستم پێ نەکردن. بۆ وێنە دەبێ زۆرتر خۆم هیلاك بکەم و بیسەلمێنم لە پیاوێك کەمتر نیم. دەبێ شەر دەگەڵ ئەو کەسانە بکەم هێمای سەرسوورمان بە ئاسانی دێننە گۆرێ و، وابکەم لە خەڵك گەلێ پرسیار بۆخۆیان دارێژن. دەبێ هەستی بەزەیی بەرامبەر بە خۆم بکوژێنمەوە و، دان بەوە دابنێم تامی ژیان ئازار نیە. تامی ژیان بەختەوەرییە. بەختەوەریش بوونی هەیە. بەختەوەری لە بەدوادا گەرانی بەختەوەریدا خۆی حەشارداوە. سەرەنجام دەبێ ئەو نهێنی و رەمزەی ناوی خۆشەویستییە بەرەی لە سەر لادەم. باسی ئەو خۆشەویستییە ناکەم لە جێگەدا و بەدەست پێدا هێنان بە سەر لەشماندا هەڵی دەلووشین، بەڵکو ئەو خۆشەویستییەی گەرەکم بوو دەگەڵ تۆ لێی تێبگەم. بچکۆلە جێگەت بەتاڵە. بەنەبوونی تۆ وا هەست دەکەم چاو و دەست بگرە دەنگم نیە، هەست بە کەمی دەکەم. سەرەرای ئەمانەش ئێستاکە کەمتر لە ئەمرۆ بەیانی و دوێنێ بۆت پەرۆشم. بۆ پێکەنین دەبێ. دەڵێن دەرد و ئازار کاتژمێر بە کاتژمێر کەمتر دەبێتەوە و، هەست دەکەی سووك دەبیتەوە. لوورەی گورگەکان لە دوورەوە دێ و بانگم ئەکەن. هەر کە نزیك بوونەوە هەست ئەکەم و دوایان ئەکەوم. بە راستی ئەم گشتە ئازار و کوێرەوەرییە تاقەت پروکێنەم تەحەمووڵ کردوە؟ ئەمە بە دڵنیا نەبوونەوە لە خۆم دەپرسم. جارێکی لە کتێبێك دا خوێندمەوە ناخۆشترین عەزاب بۆ مەحکومێك ئەو کاتەیە ئازاد دەکرێ و بەوپەری سەرلێ شێواویەوە لە خۆی دەپرسێ: چۆن توانیم ئەم دۆزەخە تەحەمووڵ بکەم؟ قسەیەکی گەلێ راستە، ژیان گەلێ سەیرە. برینەکان بە خێراییەکی شێتانەوە سارێژ دەبنەوە و، ئەگەر شوێنی برینەکان دیار نەبێ هەست ناکەین لە جێگەیانەوە رۆژێکی لە رۆژان خوێنیان لێ تکاوە. بڵێی جێگەی ئەم برینەش زوو سارێژ بێتەوە. بێشك ئەم برینەش باش دەبێتەوە. حەز دەکەم جێگەی ئەم برینەش نەمێنێ!. کەواتە هەر ئێستا وێنەکەت لە دیوار دەکەمەوە و چیتر ناهێڵم چاوانت ئەفسونم بکەن. وێنەکانیتریش دەشارمەوە و دەیاندرێنم. ئەو بێشکەیەی وەك تابوت دەگەڵ خۆم هێناومە لەت وپەت دەکەم و دەیسوتێنم. جل و بەرگەکانیش لا دەبەم و رۆژێکی دەیاندەم بە کەسێکیتر. یان واباشتر ئەوانیش فرێ بدەم. دەچمە لای دوکتور و پێی دەڵێم ئێستا رازیم و ئەم رۆژانە دەرت دێنم. پاشان تەلەفۆن بۆ باوکت یان هەر کەسێکی دیکە دەکەم و دەگەڵی دەخەوم. ئیدی لە داوێن پاکی بێزار بووم. ئەتۆ مردووی و من زیندووم. زیندووم و ئیدی پەشیمان نیم. هیچ محاکمەیەکیشم قبووڵ نیە. هیچ حوکمێك تەنانەت گەردن ئازایی تۆشم گەرەك نیە. گورگەکان لەم نزیکانەن. من هێشتا ئەوەندەم هێز و توانا هەیە سەد جاریتر، بێ ئەوەی پێویستم بە یارمەتی بە خودا و کەسیتر هەبێ ئەتۆ بینمە سەر دنیایە... خودایەگیان، لەم ژان و دەردەی! لە**

پـڕ تێك چووم. دوبـاره چـی‌یه؟ دوبـاره بروسـكه ژان. وەك رابـردوو هـەتا سـەر مێشـكم دەچـێ و دەڵێـی كـونی دەكا. لـه ئارەقەدا شەڵاڵ بووم. تەبم جۆتە سەرێ. بچكۆلە كاتی هاتووه، كـاتی لێـك جیـا بوونـەوه. مـن ئەمـەم نـاوێ، بـه كەچـكێك دەرتبێنن و بتخەنە سەتڵی زبڵەوه. نامـەوێ بـەڵام چـارم ناچـاره. ئەگـەر بـه پەلـه نەگەمـه نەخۆشـخانە هـەتا تـۆ كـه بـه هەناوو، دەرونمەوه نووساوی دەرنەهێنن، دەمكوژی. من ناتوانم. نابێ ئیزنـت پـێ بـدەم. بچـكۆلە ئـەتۆ لـه هەڵـه دا بـووی دەتگوت من ئیمانم به ژیان نیه. به پێچەوانەوه من بروام به ژیانـه. ژیـان بـه هـەموو ناخۆشـیەكانیەوه بـۆ مـن خۆشـه و به هەر نرخێك بێ دەگەڵ ژیان هەڵدەكەم. دەرۆم بچكۆلە ماڵئاوایت لێ دەكەم.

*** *** ***

له سەر سەرم بن میچێكی سپی و لـه تەنیشـتم، تـۆ لـه شووشـەیەك دای. نەیاندەهێشت بتبینـم. بـەڵام رازیـم كـردن ئەمە مـافی خۆمـه و ئـەوان بـه چـڕ و چـاوێكی ناخۆشـەوه تۆیـان هێنایـه لام. ئێسـتا كـه سـەیرت دەكـەم. پێكەنینم دێ، چونكه تۆ وه وێنەكەی ماڵەوه ناچی. كۆرپەڵە نی، تۆوێكی. تۆوێكی خۆڵە مێشی كه له نێو ئـالكۆڵێكی سـوور بـاو دا مەلـه دەكەی كه هیچی تری تێدا نابینرێ. تـۆ زۆر پـێش ئـەوەی دوكتورەكـان هەسـت پـێ بكـەن، نـەمابووی؛ خـاوەنی نینـۆك و پێست و ئەو سەروەتانەی بۆم دانا بووی نەبووی. تـۆ خولقێنـدراوی خەیاڵـەكانی مـن بـووی و، تـەنیا توانیـت شـتێك وەك دەسـت و پـێ شـتێك وەك جەسـتە و دەمو چـاو و لـووت و چـاوی وردت هـەبن. لـه راسـتی‌دا ماسـییەكی چـكۆڵەم خـۆش دەویست. له بەر خۆشەویستی ماسییەكی چكۆڵە بوو ئەم هەموو ژان و ئازارەم خولقاند و خەریك بـوو لـه سەریشـی تێـدا بچم. جێگەی بڕوا نیه. بۆ چی زووتر دەرم نەهێنای؟ بۆ چی ئەم هەموو كاتە بەنرخـەم بـه فیڕۆدا؟ بـۆ هێشـتم بمخەیـه ئەم رۆژەوه؟ باش نیم. ئەوان نیگەرانن. دەرزیان له قۆڵی راست و دەسـتی چـەپم داوه و سـۆندەی درێـژی وەك مـار سـەری دەرزیەكانیان گەیاندۆتەوه سەری دوو بووتڵ. پەرستارەكه له سەر پەنجـەی پـێ دێـت و دەچـێ. مـاوه مـاوه دوكتورێـك دێ و دوكتورێكی‌تر دەگەڵ خۆی دێنێ. سرت و خـورتێكی دەكـەن پێدەچـێ مەترسـیەك هـەبێ. زۆر حـەزم دەكـرد هاورێكەم باوكت یان باشتر لەوان دایك و باوكم لێره بان. وام هەست دەكرد گوێم له دەنگیان بـوو. بـەڵام جیـا لـەم دوو سـپی پۆشـه كەسی‌تر نەهات. تۆ بڵێی یەكێكیان هەر ئـەو كەسـه نـەبێ تاوانبـاری دەكـردم؟ ماوەیـەك لەمـەو بـەر تـووڕه بـوو و گـوتی: ((بیكەنە دوو ئەوەندە!(( چ شتێكی؟ سزایەكی؟ خۆ سزا دراوم. دەبـێ دوبـاره سـزا بدرێمـەوه. پاشـان وتـی: ((خێـرا كـەن! نازانن خەریكه تێدا دەچێ!)) كێ خەریكه تێدا بچێ؟ دەرزیەكە؟ مرۆ؟ ژیـان؟ ئەگـەر نەمانـەوێ ژیـان لـه دەسـت ناچـێ و كەس نامرێ. تەنانەت تۆش چونكه تـۆ پێشـتر مـردووی. مـردووی بـێ ئـەوەی مانـای زینـدوو بـوون بزانـی. مـردووی بـێ ئەوەی رەنگ و تام و بۆن و هەست و ئەندیشـەكان بناسـی. بـۆ هـەردووكمان بـەداخم. هەسـت بـه كـەمی و شـەرم دەكـەم. قازانجی چیه وەك پەرسێلكه به ئاسماندا بفری، بەڵام نەتوانی پەرسێلكەی‌تر بێنیه سـەر ئـەم دونیایـه ئـەوانیش وەك تـۆ بتوانن له ئاسماندا بفرن. كەڵكی چی گاڵتەی منداڵانه بكەی بەڵام منداڵت نـەبێ و ئـەوانیش منـداڵیان نـەبێ یـاری بكـەن و پێبكەنن. دەبوو خۆت راگرتبا. دەبـوو شـەڕت كردبـا و، شكسـتت دابـان. زوو تەسـلیم بـووی، زوو مەیـدانت جـێ هێشـت، ئەتۆ بۆ ژیان دروست نەكرابووی. كێ له دوو چیرۆك و هـەواڵێكی نەكبـەت دەترسـێ؟ ئـەتۆ وەك باوكـت وابـووی. ئـەو بـه پەنا بردنه بەر خوا خۆی رزگـار دەكـرد ئـەتۆش بـه لـه دایـك نـەبوون. كامـه لـه ئێمـه دوان تەسـلیم بـووه؟ مـن تەسـلیم نـەبووم. گـەلێ مانـدووم. لاقـەكانم هێزیـان نـەماوه. جـار جـاره بـەر چـاوانم لێـل و تاریـك دەبـن و، بـێ‌دەنگی یەخسـیری كـردووم، بـەڵام تەسـلیم نـابم. سـەیركه، چـەندە خـۆراگرم. مـن و تـۆ جیاوازیمـان زۆره، نابـێ خـەوم لێ بكـەوێ. دەبـێ وەخەبـەر بم و بـیر بكەمـەوه. ئەگـەر بـیر بكەمـەوه لەوانەیـه بتـوانم خـۆراگرم. مـاوەی چـەندە دەبـوو لـه زگـم دابـووی؟ سـاعەت و رۆژ و سـاڵەكان؟ هـەر رۆژێكـم بـه سـاڵێك تێ‌پـەر كـرد. چـی‌تر نـاهێڵم لـەم شیشـەیەدا بمێنیـەوه. دەبـێ لـه جێگەیەكی باشتر دابی: بەڵام له كوێ؟ لـه سـەر گـۆڵی ماگنولیـا. بـەڵام ماگنۆلیـا گـەلێ لێـره دووره. ئـەو سـەردەمه منـیش

گەڵێ بچوك بووم. كاتی ئێستا ماگنۆلیایەكی نیە. ماڵەكەی منیش تێیدا نیە. دەبێ بتبەمەوە ماڵێ. سبەی بەیانی. ئێستا شەوە و سپیەتی میچی هۆدەكە وردە وردە رەش دەبێ. هەوا ساردە. وا باشترە پاڵتۆكەم دەبەر كەم و لە قادرمەكان بچمە خوار. خێراكە برۆین. دەت بەم. حەز دەكەم لە باوەشت بگرم بچكۆلە. بەڵام ئەتۆ زۆر گچكەی. لە باوەشم دا ناگونجێی مەگەر لەسەر بەری دەستمت دانێم. بەو شەرتەی "با" نەتبا. نازانم: بڵێی "با" بتبا. بەڵام ئەوەندە قورسی بۆم هەڵناگیرێی و لاتران دەبەم. تكات لێ دەكەم دەستتم بدەیە. ئاوا. ئێستاكە ئەوە تۆە دەگەڵ خۆت دەمبەی. كەواتە تۆ تۆو نی، ماسی بچوك نی، منداڵێكی! درێژیەكەت هەتا سەر ئەژنۆی منە. نا، هەتا سەر دڵم، نا، هەتا سەر شانانم. ئەتۆ منداڵ نی، ئەتۆ پیاوێكی! پیاوێك بە دەستی گەرم و بە هێزەوە. لەمەوبەدوا پێویستم بەم دەستانەیە! پیر بووم. ئەگەر دەستم نەگری ناتوانم لە پلیكانەكان بێمە خوار. لە بیرتە ئەو كاتانەی زۆر بە ئاگاداریەوە بە پلیكانەكاندا سەرو خوارمان دەكرد، وریا بووین نەكەوین. لە بیرتە تازە پێت گرتبوون فێرم دەكردی بە تەنیا بە سەر پلیكانەكاندا سەر بكەوی و پلیكانەكانمان بە یەكەوە دەژمارد و لە قاقای پێكەنینمان دەدا. لە بیرتە هەر شتێكی بهاتایە سەر رێگەت دەوەستای و خۆت توونددو، قایم دەكرد هەتاوەكو بە پەلە خۆت بگەیەنمێ؟ ئەو رۆژەی شەڕمان بوو چونكە گوێت بۆ قسەكانم نەدەگرت؟ پاشان پەشیمان بوومەوە دەمویست داوای لێبوردنت لێ بكەم، بەڵام نەمدەتوانی. من لە ژێر چاوانەوە سەیرم دەكردی. تۆش هەروەتر هەتاكو بزەت هاتێ و منیش تێگەیشتم كە تۆ تێمگەیشتوی، پاشان چی روویدا؟ ناتوانم بیر بكەمەوە و مژۆڵەكانم قورس بوون. ئەمە خەوە یان كۆتاییە؟ نابێ تەسلیمی خەو و، ((كۆتایی)) بم. یارمەتیم بدە وەخەبەر بێم. وڵامم بدەوە: لە قازانجی ئەم فرینە گەیشتی؟ ئایا لەم خوارە زۆر كەس نەیاندەویست بتكەن بە نیشانە؟ تۆش تەقەت لێ كردن؟ تۆیان لە نێو قەڕەبالغیدا ئازار دا؟ تۆ تەسلیمی توونددو تیژی و سووكایەتییەكان بووی یان وەك دار قایم لە جێگەی خۆت مایەوە؟ ئاخرەكەی توانیت لەمە تێبگەی بەختەوەری و ئازادی و چاكە و ئەوین هەن؟ هیوادارم ئامۆژگارییەكانم بە كەڵك هاتبن. هیوادارم قەت ئەم رستە كە كفرە بە دەنگ نەتگوتبێ: ((بۆ چی لە دایك بووم؟))

هیوادارم بەم ئاكامە گەیشتبی لە دایك بوون نرخی هەیە هەتا بە نرخی رەنج و مردنیش بێ. لەوەكە توانیومە تۆ، بە نرخی ئازار و مردنیش بێ، لە هیچەوە بێنمەدەر هەست بە سەر بڵێندی و غرور دەكەم. بە راستی هەوا سارد بووە و میچە سپیەكەش سارد بووە. بەڵام گەیشتمێ، ئەمش گوڵی ماگنۆلیا.

گوڵێكی لێبكەوە. من هەرگیز نەمتوانی گوڵێك لێبكەمەوە، بەڵام تۆ دەتوانیت. لە سەر پەنجەی پێ، خۆت هەڵێنە و، دەستت درێژ بكە. ئاوا. لە كوێی؟ ئەتۆ لێرە بووی. لە بن شانانم دابووی. گەورە بووی، پیاوێك بووی. بەڵام وجوودت نیە. تەنیا شووشەیەك ئالكۆڵ كە شتێكی تێدایە، كە نەیدەویست ببێتە پیاو یان ژن لێرەیە. منیش یارمەتیم نەدا هەتا ببێتە پیاو یان ژن، هیچ شتێك وجوودی نیە. لێم دەپرسی من بۆ چی دەبوو بمویستبایە و تۆ بۆ چی دەبوو بتویستایە؟ چونكە ژیان هەیە، بچكۆلە! هەر كە وتم ((ژیان هەیە))، سۆزی سەرما نەما، خەو لە چاوانم پەڕی، هەست دەكەم دوبارە بوومەوە بە خۆم، بە ژیان. سەیر بكە، چرایەك دادەگیرسێ. دەنگێك دەبیسرێ. كەسێ رادەكا، هاوار دەكا، پاشان بێ ئومێد دەبێ. بەڵام هەزاران كەس لە دایك دەبن، سەد هەزار منداڵ و دایكان منداڵانی داهاتوون: ژیان پێویستی نەبە تۆیە نەبە من. ئەتۆ مردووی. منیش لەوانەیە بمرم. بەڵام گرنگ نیە. چونكە ژیان نامرێ.